51
پرۆژەی تیشک




# ئایا خوا کچی هەیە؟
# وەڵامێك بۆ كتێبی
# کچانی خوا




نووسینی:
روقیه صدیق عبدالعزیز




**پرۆژەی تیشك –**

# ئایا خوا کچی هەیە؟

# وەڵامێك بۆ کتێبی

# "کچانی خوا"

**نووسینی: ڕوقیە صدیق عەبدولعەزیز**

–

ناوی کتێب: ئایا خوا کچی هەیە ؟ وەڵامێك بۆ کتێبی کچانی خوا

نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٥١٣) ساڵی (٢٠٠٩)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٥١)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

## ناوەڕۆك

# بسم الله الرحمن الرحيم

(وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثاً أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ) (الزخرف: ١٩).

**بێبڕواکان وادائەنێن کە فریشتەکانی خوا کە بەندەی ڕاستەقینەن بۆ خوا، کچانی خوان! باشە ئەوان چاویان لێبووە کە خوا دروستی کردوون، ئێمە ئەو شایەتیدانە ناهەقیانە بۆ ئەنووسین و پاشان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێت.**

## پێشکەش بێت بە:

**- دایکم و باوکم کە هەمیشە لە هەوڵی پەروەردەکردنماندا بوون بە پەروەردەیەکی ئیسلامی و خوازیارم بەم نووسینە هەندێ بەختەوەرییان بۆ دروست بکەم.**

**- بە هەموو ئەو خوشکە بەڕێزانەی کە لە کاری ئیسلامیدا بە یەکتری ئاشنابووین و زیاد لە خوشکی دایك و باوکی بەتەنگ یەکترەوە بووین.**

**- بە هەموو ئەو کەسانەی کە عەوداڵی ڕاستین، کاتێکیش ڕاستییان بۆ دەرئەکەوێت بێ سڵەمینەوە تەسلیمی ئەبن و پێڕەوی لێ دەکەن.**

**لە ئەوەڵ و لە ئاخیردا...**

**- پێشکەش بێت بە نووری چاوەکەم و هێزی دڵەکەم تاجی سەرم حەزرەتی موحەممەد ﷺ کە لوتفی کرد و لە خەوێکدا ڕەشنووسی ئەم نووسینەمی بەدەستەوە بوو ئەیخوێندەوە و دڵخۆشی کردم، هەزاران سەڵات و سەلام لەسەر ڕۆحی پاکی بێت، هەروەها لەسەر ڕۆحی ئالو ئەصحابی بێت تا دونیا دونیایە و خوا خوایەتیی خۆی ئەکات..**

# پێشەکی

الحمد اللّه كثيراً طيباً مباراكاً فيه، والصلاة والسلام على رسوله وخاتم أنبيائه وعلى آلهِ وصحابته وقرابته وبعد..

ماوەیەکی زۆر نییە کە دەستەیەك نووسەر و خامە بەدەست لەناو کوردستاندا هەڵتۆقیونو بە هەق و ناهەق دژایەتی بەهاکانی دین ئەکەن، نازانرێ ئایا ئەوانە وەزیفەیەکی سەرشانیان ئەنجام ئەدەن بۆ ئەم یان بۆ ئەو یاخود بە شوێن خۆیاندا ئەگەڕێن لەو نوسینانەدا یان داخێکە و ئەیرِێژن، یان فشارێکە ئەیبەن بۆ نووسەران و ڕۆشنفکرە ئیسلامییەکان تا بێنە وەڵامو وەڵامیان بدەنەوە و بازاڕی شۆرەت و ناو دەرکردن گەرم بکەن.

یەکێك لەو کتێبە ناباشانەی کە لەم ماوەیانەدا لە بازاڕەکانی کوردستان چاپ و بڵاوکراوەتەوە کتێبێکە بە ناوی (کچانی خوا)! (یاڕەبی تەوبە)! ئەوەی ئەم نووسینەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کەسێکە بە ناوی (نوری کەریم)، لە کاتێکدا کتێبەکە بە زمانی ئینگلیزی نووسراوە و ناوی (Nine patsof disive) واتە: (نۆبەش لە هەوەسبازی)، کەچی ئەم نوری کەریمە ناونیشانی (کچانی خوا)ی داوە بە کتێبەکەی گوایە هەندێ وەرگێڕی بیانی تر ئەو ناوەیان بە باش زانیوە!!

هەرچۆن بێت ئەم کتێبە پڕیەتی لە بەدگومانی بەرانبەر بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام و خێزانە بەڕێزەکانی و تەواوی تەعلیماتە ئیسلامییەکان و وادەرئەبڕێت کە ئەم دینەی موسڵمانان لەسەری ئەڕۆن شایانی ئەوە نییە بواری بدرێت بژی و ئاڕاستەی خەڵکیی بکات..

پاش ئەوەی برایانی پڕۆژەی تیشك کۆڕێکی تەعریفییان بۆ کۆمەڵێك ڕۆشنبیر و خەڵکی قەڵەمبەدەستی ئیسلامیی گرت لەو کۆڕەدا هەندێ لەو کتێبە گومان ئامێزەیان دابەش کرد بەسەر ئامادەبوواندا و داوای ئەوەیان کرد کە هەرکەس ئامادەیە بۆ وەڵامدانەوەی یەکێکیان گفتی خۆیان بداتێ تا ئەوانیش بەکاری پێویستی

خۆیان هەڵبستن.. منیش ئەم کتێبەم هەڵبژارد و بڕیارم دا کە وەڵامێکی زانستی بۆ بنووسم. کە کتێبەکەم خوێندەوە بۆم دەرکەوت ئەم کتێبە قسەی زۆر هەڵدەگرێت و هەویرێکە ئاو زۆر ئەکێشێ، ئەوەش نە لەگەڵ کتێبەکانی پڕۆژەی تیشکداو نەلەگەڵ هیمەتی خوێنەرانی ئەم سەردەمەشدا ئەگونجێ بۆ هەموو گومان و ڕخنەیەکی هەڵوێستە بکەی و قسەی تەواوی لەسەر بکەی، بۆیە ناچار چەند بابەتێکی هەستیاری ئەو کتێبەم هەڵبژارد و وەڵامەکانم تایبەت کرد بەوانەوە، بەو هیوایەی کە ئەوەندە بەس بێت و خۆ ئەگەر خوای گەورەش بواری زیاتری ڕەخساند ئەوە نووسینی سەربەخۆی تر لەسەر گومانەکانی تری بنوسرێت..

## ئەو باسانەی کە من بە پێویستم زانی لەسەریان بنووسم بە کورتی ئەمانە بوون:

- گومانەکانی نووسەر لەسەر فرەژنی پێغەمبەر ﷺ.
- گومانەکانی نووسەر لەسەر ململانێی دروستکراوی نێوان حەزرەتی فاتیمە و حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق.
- گومانەکانی نووسەر لەسەر دایکمان عائیشە و بەشدارییە سیاسیەکانی ئەو دایکە بەرێزە..
- گومانەکانی نووسەر لەسەر باڵاپۆشی (حیجاب) و فەلسەفەکانی ئەو یاسایە.
- گومانەکانی نووسەر لەسەر گەڕانەوەی ئەستێرە سینەماییەکان بۆ لای ئیسلام و کاری ئیسلامیی.
- گومانەکانی نووسەر لەسەر:

⋆ شایەتیدانی ئافرەت

⋆ میراتی ئافرەت

⋆ ناشیزەبوونی ئافرەت

⋆ فەلسەفەی تەڵاق.

⋆ دایەنی.

⋆ دادوەری ئافرەت...... هەروەها.

**من لەم نووسینەدا هەوڵمداوە کە کورتەیەکی ڕەخنەی نووسەر لە هەر بابەتێکدا باس بکەم و نەشتەری ڕەخنەی لێ هەلگرم، پاشان ڕاستیی مەسەلەکە وەك لە سەرچاوە ئیسلامییە رەسەنەکاندا هاتووە باس بکەم و ئیتر زۆر لەسەر ئەوە نەڕۆم کە چەند نووسەر ناپاك و گزیباز بووە لە گواستنەوەکانیدا و بەسمە کە بە سەرچاوەی ڕەسەن و وەڵامی لوژێکی گومانەکانی ئەوم بەرباد کردووە و چاوڕۆشنیم بە خوێنەران داوە، شایانی باسیشە ناونیشانی کتێبەکە هیچ پەیوەندییەکی بە ناوەڕۆکی کتێبەکەوە نییە..**

**بە هەرحاڵ من لافی ئەوە لێنادەم کە نووسینەکەم بێ کەموکوڕییە و تەواوی مەرجەکانی نووسینی زانستیی تێدایە، بەڵکو دان بەوەدا ئەنێم کە نووسینەکەم سەرەتایە و چاوەڕوانی ڕێنمایی و مەحکەمکاریی ئەکات لە لایەن نووسەرە ئیسلامییە بەڕێزەکانەوەو منیش تەنیا ئەوە دڵخۆشم ئەکات کە ئەرکێکی سەرشانم بەرانبەر دینەکەم و پاشان بەرانبەر برایانی بەڕێزی پرۆژەی تیشك ئەنجام داوە، کە ماڵ و بێ عەیبیش هەر بۆ خوایە..**

**إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت وما توفيقي الا بالله**

**عليه توكلت وإليه أنيب.**

**روقيه صديق عبدالعزيز**

**٢٠٠٨/٦/٢٥ سلێمانی**

# تیشكێك بۆ سەر نووسینەكەی خوشكە ڕوقیە صدیق

الحمد لله وكفى وسلام على عبده المصطفى وبعد.

لە ڕۆژی (٢٠٠٦/٨/١٠) كۆڕێكمان بۆ هەندێ لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی ئیسلام سازدا لە سلێمانی، یەكێك لەو بەڕێزانەی كە ئامادەی كۆڕەكە بوون و پاشان ئامادەیی هاوكارییان دەربڕی بۆ پرۆژەكانی تیشك بریتی بوو لە خوشكە (روقیە صدیق).

ئەو خوشكە بەڕێزە كتێبی (كچانی خوا) جیهانی شاراوەی ژنانی ئیسلامی لێوەرگرتین، تا وەڵامێكی ڕەخنەیی لەسەر بنووسێ، پاش ئەوەی وەڵامەكانی تەواو كرد و ئێمەش خوێندنەوەمان بۆ كرد بۆمان دەركەوت نووسینەكە با وەك خۆی دەڵێت سەرەتایە بەڵام شایستەی ئەوەیە بڵاو بكرێتەوە و بچێتە بەردەستی خوێنەرانی كورد، چونكە لەلایەك بابەتەكە زۆر پەیوەندە بە ئافرەتانەوە و پێویستە ئەوان خۆیان لەسەر كتێبەكانیان بێنە وەڵام و بنووسن، لەلایەكی تریشەوە نووسینەكە ماندوو بوون و سۆراغكردنی زۆری پێوە دیارە و بەرهەمی ڕەنج و بەدواداچوونە، بەو شێوەیەش شایانە بچێتە ناو زنجیرە كتێبەكانی پرۆژەی تیشك.

ئەوەشی زیاتر هانی داین ئەم نووسینە لەئامێز بگرین ئەوە بوو، نووسەری بەڕێز پێش قوفڵدانی نووسینەكەی خەوێكی بە پێغەمبەری سەردار و ئازیزەوە بینیوە وەك پێمان گەیشت ئەو نووسینەی هەڵسەنگاندوە و ڕەزامەندی دەربڕیوە بۆی. دیارە نووسینەكە بەرگریكردنێكی زۆری تێدایە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و خانەوەدا و خێزانە بەڕێزەكانی، ئێمە شانازیی ئەكەین بەوەی كە ئاماژەیەكی پێغەمبەر ﷺ بەس بێت بۆ ئەوەی دڵخۆشیمان بداتێ و پشتیوانیمان تیادا دروست بكات بۆ هەر خێرێك، ڕێنماییەك یان ڕوونكردنەوەیەكی تێدا بێت بۆ كایەیەك لە كایەكانی ژیان یان بابەتێك لە بابەتە ئاڵۆزەكانی دونیای مەعریفەت.

ڕاستە ئێمە ئاواتمان گەورەترو ئومێدمان وابوو نووسینەكە فراوانتر بوایە، بەڵام وەك عەرەب ئەڵێت: (أول الغيث قطرة ثم ينهر)، باران بە دڵۆپێك دەست پێ ئەكات و پاشان ئەبێت بە لێزمە.

خوا لە نووسەری بەڕێزی ئەم نووسینە قەبووڵ بکات و پشتیوانی زیاتریشی بکات بۆ خزمەتی زیاتر.

**اکرام کریم**

**لە بری برایانی پرۆژەی تیشك**

**٢٩/ ٦/ ٢٠٠٨**

جیرالدین برۆکسی نووسەری کتێبی (کچانی خوا) هەر لە سەرەتای دەستپێکی نووسینەکەیەوە پەنجەی تاوان و ڕەخنەئامێز ئەخاتە ناو خانەوادە و خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەبێ ئەوەی شارەزاییەکی ئەوتۆی دەربارەیان هەبێت، بەو نیازەی کۆمەڵێك خەڵك و خوێنەر چەواشە و ڕەشبین بکات بەرانبەر بە ئیسلام و بەرنامە گشگیرییەکەی کە دەرمانی هەموو دەردە کۆمەلایەتییەکانە، دیارە بۆ سەلماندنی قسە و باسەکانیشیان بەلگەیەکیان بەدەستەوە نییە کە شایانی باس بێت، بەڵکو هەر توتی ئاسان قسەی درۆ و هەڵبەستراو و بێ بنەما و دوور لە ڕاستییان لەبەر کردووە، هەر جارە و بە شێوازێکی نوێ دایئەڕێژنەوە و شەرم ناکەن لەوەی کە بە بەهێزترین بەلگەی قورئان و فەرموودە وەلامیان ئەدرێتەوە و متمانەی خۆیان و نووسینەکەشیان لەدەست ئەدەن..

نووسەر لە لاپەڕە (١٠ ـ ٢٥٨)ی کتێبەکەیدا زیاتر تەرکیز ئەکاتە سەر کۆمەڵێك باسی وابەستە بە کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکانی و پیادەکردنی یاسای فرەژنی و ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی کە لە ژیانی پێغەمبەرێتییدا ﷺ دێتە ڕێی وەکو: بوختانەکەی دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە و مارەکردنەوەی زەینەبی کچی جەحش و غیرە و کێشمە کێشی ناو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئێمەش بە پشتیوانی خوای گەورە ڕۆشنایی ئەخەینە سەر ئەو گلەیی و گازندە و گومانانەی کە نووسەر بە ڕاشکاوی ئاماژەیان پێ دەکات.

١ـ نووسەر ئەڵێت: "پێغەمبەری ئیسلام حەزی لە ژن بووە، تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بووە یەکەم ژنی مارە کردووە".[1]

لە وەلامدا ئەڵێین: پێغەمبەر ﷺ مرۆڤ بووە نەك مەلائیکە، ئیتر ئەبێت بۆچی نووسەر واگومان بەرێت کە نابێت ئەو پێغەمبەرە ﷺ وەك مرۆڤ ئارەزووی ژن هێنانی هەبێت و چێژ لە ژیانی خێزانی وەربگرێت..

یەکەم شتێکیش کە بەبیر و هزری مرۆڤەکاندا بێت لە یەکەم ژن هێنانی پێغەمبەردا ﷺ گرنگی نەدانی بووە بە هۆکارە جنسی و ئارەزووە جەستەییەکان، خۆ ئەگەر

[1] لاپەڕە (١٠)ی کتێبی (کچانی خوا).

**وانەبوایە ئەوا ئەمیش وەکو هەموو هاوتەمەنی خۆی قایل نەدەبوو بە ئافرەتێك کە بە پانزە ساڵ لە خۆی گەورەتر بێت و ئافرەتێك بێت کە پێش شووکردنی بە موحەممەد ﷺ دوو شووی تری کردبێت کە خاتوو خەدیجەی کچی خووەیلید بوو رضي الله عنها، دەی ئیتر کوا پشکی ئارەزووبازیی لەم ژنهێنانەدا؟!**

**٢ـ نووسەر ئەڵێت: "موحەممەد هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووە کە خەدیجەی دەوڵەمەند و خاوەن کارەکەی کە دە ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو بیکات بە هاوسەری خۆی".[2]**

**لە وەڵامدا ئەڵێین: بەپێی هەموو سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان خاتوو خەدیجە پانزە ساڵ لە موحەممەد ﷺ گەورەتر بووە، نەك دە ساڵ، پاشان خەدیجە ناردییە خوازبێنی موحەممەد ﷺ، نەك موحەممەد بە دوای ئەو کارەدا گەڕابێت..**

**خاتوو خەدیجە رضي الله عنها ئافرەتێکی بێوەژن بوو، کە دوو شوی تری کردبوو، شووی یەکەمیان عەتیقی کوڕی عائز بوو، پاشان ئەمرێ و شوو بە ئەبوهالە ئەکات و ئەویش ئەمرێ و پاشان زۆربەی گەورە پیاوانی قورەیش دێنە خوازبێنی ئەو بەڕێزە و وەڵامی کەسیان ناداتەوە و خۆی خەریك دەکات بە کاری بازرگانییەوە، دیارە بە هۆی زۆریی سەروەت و سامانییەوە خەڵکیی بە پارەکەی کاری بازرگانییان بۆ ڕادەپەڕاند.. لەو کاتەشدا موحەممەد ﷺ هەر خەریکی بازرگانی کردن بوو، کاتێك کە خاتوو خەدیجە وەك بازرگانێکی لێهاتوو، کە هەمیشە ویستی وابوو کەسانێك لەگەڵیدا کار بکەن جێی متمانەی بن.. ڕەوشت بەرزی و دەستپاکی و ئەمانەتپارێزیی کە کۆمەڵێك سیفاتی مەشهوری موحەممەد ﷺ بوو لەناو عەرەبەکاندا، وای کرد لە خەدیجە کە بنێرێ بە شوێنیدا و پێی ڕابگەیەنێ کە ئەگەر بە کاری بازرگانییەکەی هەڵسێت ئەوا چەند بەرانبەری خەڵکی تر گرنگی پێ دەدرێ و بەشی ماندووبوونەکەشی زیاتر دەبێت.. موحەممەدیش ﷺ داواکەی پەسەند کرد و دەستی کردە کاری بازرگانی.. یەکەم سەفەرێك کە کردی بۆ شام و مەیسەرە کە خزمەتکاری خەدیجە بوو لە خزمەتیدا ڕۆیشت و کۆمەڵێك سیفاتی جوانی لە موحەممەد ﷺ بینی و گێڕایەوە بۆ خاتوو خەدیجە، وەك: ریکلام نەکردن بۆ کەل و پەلەکانی و**

[2] لاپەڕە (١٠)ی کتێبی (کچانی خوا).

سوێند نەخواردن بۆ ساغ کردنەوەیان کە لەوەوبەر و لە هیچ کام لە پیاوەکانی تری خاتوو خەدیجە سیفاتی بەو جۆرەی نەدیبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بە سوود و قازانجێکی زۆر و بەرچاوەوە گەڕایەوە لای خاتوو خەدیجە، دیارە ئەم دیاردە ناوازەیە کاری کردە سەر خاتوو خەدیجە و کەوتە خولیای ئەوەی کە چۆن ئەم گەنجە نموونەییەی لە کیس نەچێت... ئەوە بوو باسەکەی لای هاوەڵێکی خۆشەویستی بە ناوی نەفیسەی کچی مەنبەوە درکاند و ئەویش چووە لای موحەممەد و باسەکەی بۆ گێڕایەوە و موحەممەدیش ﷺ بە هۆی ئەو هەموو شەرەف و ناموس و خانەدانییەی کە هەیبوو قبوڵی کرد و پرۆسەی هاوسەرگیرییان دەست پێکرد کە لەو کاتەدا خاتوو خەدیجە تەمەنی چل ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی هاوسەرییان درێژەی کێشا تا خاتوو خەدیجە ماڵئاوایی لە دونیا کرد.. بە ماوەیەکیش دوای مردنی هاوسەری خۆشەویست و پشتیوانی بیری لە ژنهێنان نەکردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چەند ساڵەی کە لە پاش خەدیجە بەسەری برد و خاوەنی خێزانەکانی تریشی بوو، بە وتەی خاتوو عائیشە هەموو بەیانییەك بەر لە چوونە دەرەوەی ئاماژەی بە هەندێ لە سیفاتە جوانەکانی و ئەو بیرەوەریانەی کە هەیبوو لەگەڵیدا باسی دەکرد، بە شێوەیەك ئەم حاڵەتەی پێغەمبەر ﷺ کاری کردبووە سەر خاتوو عائیشە و ئەیفەرموو: وەڵڵاهی ئەوەندە غیرە لە خاتوو خەدیجە ئەکەم کە لە گۆڕیشدایە، لە خێزانەکانی تری نایکەم، کەواتە ئەتوانین بڵێین پێغەمبەری خوا ﷺ نموونەی وەفاو خۆشەویستی بوو بۆ خاتوو خەدیجە رضي الله عنها.

٣- نووسەر ئەڵێت: "موحەممەد کرێگرتەی خەدیجە بووە بۆ کاری بازرگانی و نانی ڕۆژانەی داوە".

لە وەڵامدا ئەڵێین: شایستە نییە بۆ کەسی ژیر و دانا وشەی کرێگرتە بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بەکار بهێنێ، چونکە بەو کاری کەسابەت و مامەڵە کردنە ناوترێ کرێگرتە، بەڵکو ئەو کارە شەریکایەتی بووە، (ماڵ) لە یەکێك و (هەوڵ) لە یەکێکی تر، دیارە ئەو جۆرە کارەش کارێکی باو بووە و ئێستاش هەر بەردەوامە لە جیهانی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەدا. ئەبو سوفیان کە گەورەی قوڕەیش بوو هەمان کاری

کردووە و هەرگیز بەوە قایل نەدەبوو کەس بە کرێگرتەی کەسێکی تری بزانێ، ئیتر نووسەر ئەم وشەیە بۆ بەکاردێنێ و چ مەبەستێکی ناشەریفانەی هەیە تێیدا؟

کەواتە کەس نانی ڕۆژانەی موحەممەدی نەداوە، نە خەدیجە و نە کەسانی تریش، بەڵکو خۆی کاری کردووە و ڕەنجی داوە هەروەکو هاوبەشی کردنی مام و ئامۆزاکانی لە ئیش و کار و ڕەنج کێشاندا، یاخود شوانی کردن و سەرپەرشتی کردنی مەڕ و ماڵات بە موچەیەکی دیاریکراو[3].. هەرگیز قایل نەبووە ژێردەستە و چاولەبەری هیچ کەسێك بێت و کارکردنی کردە سەرچاوەی ڕزق و رۆزی بۆ خۆی.

٤. نووسەر ئەڵێت: "خەدیجە موحەممەدی دەوڵەمەند کردو پلەو پایەیەکی بۆ دروست کرد".[4]

لە وەڵامدا ئەڵێین: لاریمان لەوە نییە خاتوو خەدیجە هەموو سامانەکەی خستە پێناو بانگەواز و پەیامی خوایی، بەڵام موحەممەد ﷺ لە ژیانیدا بیری لە دەوڵەمەندی نەکردۆتەوە و دیاردەی دەوڵەمەندیشی پێوە نەبینراوە. سەبارەت بە پلەو پایەی خاتوو خەدیجە هیچ پلەو پایەیەکی بۆ موحەممەد ﷺ دروست نەکرد، بەڵکو موحەممەد ﷺ پلە و پایەی بۆ خاتوو خەدیجە دروست کرد، هەر وەکو چۆن بۆ هەموو خێزانەکانی تری دروست کرد و هەردەم و هەمیشە مێژوو شانازیی دەکات بە شارەزایی و قارەمانێتی و ڕەوشت بەرزییان (ڕەزای خوایان لێ بێت)، کەواتە هەر بە بوونیان لەگەڵ موحەممەد ﷺ و سوودمەندبوونیان لە هەڵسوکەوت و پەروەردە و پێگەیاندنی ئەوە بوونەتە خاوەن ئەو مێژووە گەشەی کە بە نموونە ئەهێنرێنەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، خۆ ئەگەر بە هۆی ئەو دەوڵەمەندییەوە شکۆدار بووبێت، دەی خۆ بە تێپەڕبوونی کات و زەمەن سەروەتەکەش نەماو خاتوو خەدیجەش کۆچی دوایی کرد و هەژاریش کەوتن، ئەی بۆ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پایەداری و شکۆداری لە

[3] لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مابعث اللّه نبياً الا رعى الغنم. فقال أصحابه: وأنت؟ فقال: نعم، كنت أرعاها على قراريط لأهل مكه). قراريط: جزء الدينار أو الدرهم.

[4] لاپەڕە (١٠) ی کتێبی (کچانی خوا).

بره‌ودا بوو به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ توانی ببێته‌ خاوه‌ن ده‌وڵه‌تێك، هه‌موو وڵاتانی فارس و ڕۆم و دوورگه‌ی عه‌ره‌بی پێی له‌به‌ر هه‌ڵبكێشن و ته‌سلیمی ئه‌و واقعه‌ ببن.

٥. نووسه‌ر ئه‌ڵێت: "خاتوو خه‌دیجه‌ چوار كچی بۆ موحه‌ممه‌د خسته‌وه‌، كه‌ ته‌نیا یه‌كێكیان ته‌مه‌نی منداڵی تێپه‌ڕاند، ئه‌ویش فاتیمه‌ بوو". [5]

له‌ وه‌ڵامدا ئه‌ڵێین: خاتوو خه‌دیجه‌ ﵂ دوو كوڕ و چوار كچی بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ خسته‌وه‌، كوڕه‌كان ناویان قاسم و عه‌بدوڵلا بوو.. كه‌ خوای گه‌وره‌ (قاسم)ی له‌ ته‌مه‌نێكدا برده‌وه‌ توانای سواربوونی وڵاخی هه‌بووه‌، به‌ڵام عه‌بدوڵلا هه‌ر به‌ منداڵی مرد، مردنه‌كانیشیان پێش هاتنی په‌یامی خوایی بوو بۆ موحه‌ممه‌د ﷺ. سه‌باره‌ت به‌ كچه‌كانیشی كه‌ زه‌ینه‌ب و ڕوقیه‌ و ئوم كلسوم و فاتیمه‌ بوون، هه‌ر چواریان ته‌مه‌نی منداڵییان تێپه‌ڕاند و شوویان كرد و هه‌ریه‌كه‌یان بوونه‌ خاوه‌ن ماڵ و مێردی خۆیان، له‌ هه‌مان كاتیشدا موسڵمان بوون و كۆچیشیان كرد له‌ پێناو به‌رزڕاگرتنی بیروباوه‌ڕه‌كه‌یاندا (ره‌زای خوایان لێ بێت)، لێره‌دا پێویسته‌ چه‌ند وشه‌یه‌ك له‌ ژیانیان بخه‌ینه‌ به‌رچاو تا خوێنه‌ران هه‌ڵه‌ و بێئاگایی نووسه‌ریان بۆ ده‌ربكه‌وێت له‌ ئاست پێغه‌مبه‌ر ﷺ و خانه‌واده‌ به‌ڕێزه‌كه‌ی:

أ ـ زه‌ینه‌ب كچه‌ گه‌وره‌ و نۆبه‌ره‌ی باوك و دایكی بوو، خێزانی ئه‌بولعاصی كوڕی ڕه‌بیعی خوشكه‌زای خاتوو خه‌دیجه‌ی دایكی بوو، خاوه‌نی دوو كوڕ بوو به‌ ناوی عه‌لی و ئومامه‌، ئه‌م ئافره‌ته‌ به‌ڕێزه‌ له‌ شاری مه‌دینه‌ ماڵئاوایی له‌ ژیان ده‌كات و له‌ گۆڕستانی به‌قیع به‌ خاك ئه‌سپێردرێ.

ب ـ ڕوقیه‌ كچی دووه‌می پێغه‌مبه‌ر و خاتوو خه‌دیجه‌ بوو، خێزانی خانه‌دان و ناودارترین گه‌نجی قوڕه‌یش عوسمانی كوڕی عه‌فان بوو، خاوه‌نی یه‌ك كوڕ بوو به‌ ناوی عه‌بدوڵلا له‌ ته‌مه‌نی (٦)ساڵیدا خوای گه‌وره‌ لێی وه‌رگرته‌وه‌ و له‌ ساڵی دووه‌می كۆچی و كاتی گه‌یشتنی موژده‌ی سه‌ركه‌وتنی پێغه‌مبه‌ر و موسڵمانان له‌ غه‌زای به‌در گیانی پاكی به‌ په‌روه‌ردگار سپارد.

---

[5] لاپه‌ڕه‌ (١٠) ی كتێبی (كچانی خوا).

ج ـ ئوم كلسوم سێیەمین كچی باوك و دایكی بوو، پاش مردنی ڕوقیەی خوشكی، پێغەمبەر ﷺ مارەی ئەكات لە هەمان زاوای بە ئەمەك و فیداكاری (عوسمانی كوڕی عەففان) و لەو ڕۆژە بە دواوە حەزرەتی عوسمان نازناوی (ذي النورين) وەردەگرێت و بە هۆی ئەوەوە كە بەرودوا مێردی دوو كچی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، ئەمیش هەروەكو دوو خوشكەكەی تری لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مانگی شەعبانی ساڵی نۆهەمی كۆچی ماڵئاوایی لە ژیانی دونیا دەكات.

د ـ فاتیمە چوارەمین كچی پێغەمبەر و خاتوو خەدیجە بوو، خێزانی شۆڕەسواری ئەم ئیسلامە (عەلی كوڕی ئەبوتالیب) كە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بوو، خاوەنی چوار منداڵ بوو، دوانیان كوڕ بە ناوی حەسەن و حوسەین و دوانیشیان كچ بە ناوی زەینەب و ئوم كلسوم (رەزای خوایان لێ بێت)، كە پێغەمبەری بابە گەورەیان ئەو ناوانەیان لێ نابوون، تەنها ئەم كچەی بە شەش مانگ پاش وەفاتی باوكی ئەمێنێتەوە، پاشان ئەمرێ و ماڵئاوایی لە هەموو خۆشەویستانی دەكات و بەرەو خۆشەویستترین خۆشەویستەكانی ئەكەوێتە ڕێ كە ئەویش خوا و پێغەمبەری خوا بوون بۆی رضي الله عنها.

٦ـ نووسەر ئەڵێت: "موحەممەد كەسێكی نەخوێندەوار و بێ دایك و باوك بوو، هیچ كات خەدیجە لەو باوەڕەدا نەبووە كە داوایەكی بەو شێوەیەی لێ بكرێت كە ببێتە هاوسەری موحەممەد".[6]

لە وەڵامدا ئەڵێین: لە سەرەتاوە باسمان كرد كە خاتوو خەدیجە خۆی ئەو داوایەی كرد، نەك پێغەمبەر ﷺ هەروەكو خۆی لە لاپەڕە (١٠)ی پەرەگرافی دووەمدا پێچەوانەی قسەكەی خۆی ئەڵێت: "لە دابونەریتی ئەو سەردەمەی مەككەدا پێشنیازی هاوسەرێتی ژنان لە پیاوان بە كارێكی ناوازە دادەنرا، خەدیجە لەوانە بوو كە كاری وای لەدەست هات...". پاشان سەبارەت بە پارچەكەی تری ڕەخنەكەی كە گەورەیی خوا و پێغەمبەری ئەم ئیسلامە دەرئەخات كە پێغەمبەر كەسێكی نەخوێندەوار بووە و خوای گەورە لە سورەتی ئەعراف ئایەتی (١٥٨)دا ئەفەرموێ: (..فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) واتە: ئێوەی ئادەمیزاد

[6] لاپەڕە (١٠)ی كتێبی (كچانی خوا)

**باوەڕبهێنن بە خوا و بە پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی، ئەو پێغەمبەرەی کە باوەڕی هێناوە بە خوا و بە فەرموودەکانی خوا لە قورئان و تەورات و ئینجیلدا، ڕێ و شوێنی ئەو پێغەمبەرە بگرن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن بۆ ئەوەی ڕێنمونی وەرگرن و لە ڕێی ڕاست لانەدەن و بەردەوام بن لەسەر باوەڕەکەتان.**

**با ئەوەشمان لەیادنەچێت کە یەکەمین سورەتێك دابەزییە سەر پێغەمبەر ﷺ سورەتی (العلق) بوو، یەکەم فەرمانێك کە دای بە سەریدا و خستیە ئەستۆی خوێندن بوو، بە (اقرأ) موفاتەحەی کرا و خوێندن و نووسین فێر کرا، پاشان بە کاری پێغەمبەرێتی هەستا.**

**کەواتە لێرەدا گەورەیی خوا و پەیامەکەیمان بۆ دەر دەکەوێت کە چۆن توانی لەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ئەو پێشەوا و مامۆستای مرۆڤایەتییە دروست بکات کە جێگای تێرامان و شانازیی زانا بەناوبانگەکانی مێژووش بێت.. بۆ نموونە:**

**بەرنادشۆ کە زانایەکی ئینگلیزی لە دایکبووی شاری کانیای ١٨١٧ز-١٩٢٠ز، نووسراوێکی نووسی بە ناوی (موحەممەد)، بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانیا سوتاندیان، کە تیایدا ئەڵێت: (بێگومان جیهان زۆر پێویستی بە پیاوێك هەیە لە شێوەی موحەممەد بیر بکاتەوە، ئەو موحەممەدەی توانی وابکات ئایینەکەی بە بەردەوامی و نەبڕاوەیی بمێنێتەوە و ڕێزدار بێت، من زۆرێك لە گەل و هۆزی خۆم دەبینم چوونەتە ناو ئاینی موحەممەد بە ئاشکرا، ئەم ئایینە پێگەیەکی فراوان بوو بۆ خۆی لە کیشوەری ئەوروپا دائەمەزرێنێ، پیاوانی کەنیسە لە سەدەکانی ناوەڕاست وایان لە خەڵك گەیاند بوو کە موحەممەد دژی ئایینی مەسیحییەتە، بەڵام من دیراسەی ژیانی ئەو پیاوەم کرد بینیم شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر و دژی مەسیحییەتیش نییە، بەڵکو پێویستە ناوی لێ بنرێ (ڕزگارکەری مرۆڤایەتی)، بە بۆچوونی من ئەمڕۆ ئەو پیاوە ئەگەر ئیش و کارەکانی جیهان لەئەستۆ بگرێ ئەتوانێ هەموو کێشەکانی چارەسەر بکات بە شێوەیەك ئاشتی و خۆشبەختی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی فەراهەم بهێنێت).[7]**

[7] ئینتەرنێت - پێگەی ئیسلام پەیك.

هەروەها سەبارەت بە بوون و نەبوونی دایك و باوك بۆ هەر یەكێك لە مرۆڤەكان نە شانازییە و نەبێ ڕێزی، چونكە هەر هەمووی لە دەستی خوادایە و كەس توانای بەرگری كردنی لەو مەسەلەیەدا نییە، ویست و ئیرادەی خواش وابووە كەسێك بكاتە هەڵگری پەیامی خوایی و ڕابەرایەتی مرۆڤەكانی پێ بكات كە خاوەنی هەموو جۆرە موعاناتێك بێت تابتوانێ بە كردەوەیی (عمل) ئاگای لە بەڕێوەبردنی تاك و كۆمەڵی كۆمەڵگاكەی بێت..

٧- نووسەر ئەڵێت: "خەدیجە هەرگیز لە ژیانیدا گوێبیستی ئایەتی (پیاوان كارساز و سەرپەشتی ژنانن لەبەر ئەوەی خوا هەندێ لەوانەی بەسەر هەندێكا فەزیلەت داوە، لەبەر ئەوەی پیاوان لە ماڵی خۆیان نەفەقەی ژنانیان ئەدەن)، هاتنە دەرەوەی ئایەتێكی وەها لە زاری موحەممەد زۆر سەیر دەبوو، كاتێك كە خەدیجە لە ژیاندا بووە و نانی ڕۆژانەی موحەممەدی داوە.."[8].

لە وەڵامی نووسەردا ئەڵێین: مەخابن بۆ نووسەر ئەوەندە ئەم وشەی نان و بژێوییە دووبارە ئەكاتەوە و بە كارێكی نەشیاوی ئەزانێ، كەچی لە هەمان كاتدا ئەمڕۆ بە ڕۆشنبیری و ئازایەتی و مۆدێرنی ئەزانن كە ژنان توانای پارە پەیداكردنیان هەیە و ئەركی زۆری خێزانەكەیان لە ئەستۆ گرتووە، لە سەرەتاوە ئاماژەمان بە كار و كەسابەتی پێغەمبەر ﷺدا كە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە تا پاش پێكهێنانی ماڵ و خێزانیش هەر پشتی بە خۆی بەستووە و هەرگیز چاولەبەری كەس نەبووە، بەڵكو هەمیشە دەستی یارمەتی درێژ بووە بەرانبەر دەوروبەرەكەی، شورەیی و نەشیاویش نییە، ئەگەر ژن و پیاو یارمەتی یەكتر بدەن، لەبەر ئەوە هەردووكیان مرۆڤن و خوای گەورە ئەو شیاوییەی پێ بەخشیوون، (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ) وەهاتنە خوارەوەی ئایەتی (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عةلى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عةلى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ)، ڕاستە كە ئەم ئایەتە پیرۆزە لە مەدینە و لە پاش كۆچی دوایی خاتوو خەدیجە رضي الله عنها هاتۆتە خوارەوە و هیچ كاتێكیش بەلایەوە سەیر نەدەبوو كە گوێبیستی ئەو ئایەتە پیرۆزە ببوایە، چونكە مێژوو شاهیدە لەسەر فیداكاری و جوامێری ئەو

[8] لاپەڕە (١١)ی كتێبی (كچانی خوا).

دایکە بەڕێزە کە سەر و ماڵی خستە پێناو بەرز ڕاگرتنی پەیامی خوایی و بیستنی ئایەتێکی بەو جۆرەش لای کەسی شارەزا و ڕۆشنبیر جێگای شانازی و خۆشحاڵییە، چونکە پارێزگاریی لە بەها باڵاکانی دەکا و مافی ڕەوای خۆی تێدا دەبینێ کە خوا یاربێت لەمەودوا باسی لێوە دەکەین.

سەرەتا پێویستە بزانین وشەی (قوامە) کە بریتییە لە مودیریەت و ڕاپەڕێنەر و ڕاگرە مانای سەنەد و پشگیری ئافرەتان ئەگەیەنێ، نەك ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەی کە لە کۆمەڵگای کوردیدا دەرئەکەوێ کە پیاو فەزڵ و نرخی زیاترە لە ئافرەتان تەنیا لەبەر ئەو نان و بژێوییەی کە دەیدات!!

ئەو فەزڵەی کە خوای گەورە باسی لێوە دەکات کۆمەڵێك سیفاتن کە ئەشێت ژنان پشتیان پێ ببەستن و هەموو کەرامەت و ڕێزی ژیانیان بە پارێزراو بزانن لە سایەیاندا، ئەو بژێوییە کە خوای گەورە باسی دەکات یەکێکە لە وەزیفە و کارەکانی پیاو..

ئاشکرایە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی هاتنی ئاینی ئیسلام و بەرنامە ئاسمانییەکانی تریش بە درێژایی مێژوو نەهێشتنی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بووە، چ لەسەر بنەمای جیاوازیی ڕەگەز بێ یا لەسەر جیاوازی ئایین و ڕەنگ و زمان و بەرژەوەندی ماددیی، هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ).[9] مەبەستی ئایەتەکە ڕوونە کە پێغەمبەران بەرنامە و پەیامی خواییان هێناوە بۆ گرۆی ئادەمی تا ئەو خەڵکە بە دادگەریی بژین، بێگومان ئەو خەڵکەش بریتین لە دوو ڕەگەز: ڕەگەزی پیاو و ڕەگەزی ئافرەت، هەردوو ڕەگەزیش لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا یەکسانن و هیچ جۆرە جیاوازییەکیان نییە، تەنها چەند شتێك نەبێت کە تایبەتە بە پیاو بە هۆی خەسڵەتی نێرینەوە، چەند شتێك تایبەتە بە ئافرەت بە هۆی خەسڵەتی مێینەوە..

ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە کە ئایینی ئیسلام وەك بەرنامەیەکی ئاسمانی کاتێ کاروباری مرۆڤەکان ڕێك دەخات بە یەك چاو سەیری هەردوو ڕەگەز دەکات، چونکە

[9] سوورەتی حدید ئایەتی (٢٥)

**خوای گەورە خۆی دروستکەری هەردوو ڕەگەزەکەیەو وەك مرۆڤ سەیری هەردووکیان دەکات، ئەرك و مافیش بۆ هەریەکەیان دیاریی دەکات، نەك تەنیا ئەرك بۆ یەکێکیان و ماف بۆ ئەویتریان، بەڵکو ئەوەتا ئەفەرمویٚ: (وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ) (البقرة: ٢٢٨) واتە: بە ئەندازەی ئەو ئەرکانەی لەسەر شانی ژنە، مافیشیان هەیە خوای گەورە پێویستی بە هیچ کام لەو دوو ڕەگەزە نییە تا مافی لایەك بدات و لاکەی تری بچەوسێنێتەوە، پلەی ڕێزداریش لای خوا بە پلەی لە خواترسانە نەك بە جۆری ڕەگەز (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ).[10]**

**هەروەها لە ئایەتی یەکەمی سورەتی (النساء)دا زۆر بە ڕەهایی ئەو یەکسانییە بەرچاو ئەخات و ئەفەرمویٚ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء: ١). واتە: ئەی خەڵکینە بترسن لەو خوایەی کە هەمووتانی لەیەك نەفس دروست کردووە، کە ئەویش ئادەمە و لە نەفسی ئادەمیش حەوای دروست کرد کە ژن بوو، جا سەرنج بدەن لەو یەکسانییەی کە خوای گەورە لە نێوان مرۆڤەکاندا دروستی کردووە لە سەرەتای دروست بوونیانەوە، ئەڵێین: خوای گەورە ئەیتوانی هەروەکو چۆن ئادەمی دروست کرد بەو شێوەیەیش حەوای دروست بکردایە، بەڵام خواش زاناترە بۆ ئەوەی لە ڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا هیچ ڕەگەزێك شانازیی بە ئەسڵی تەن و دروست بوونەکەی خۆیەوە نەکات، واتە ڕەگەزێکیان خۆی بە پیرۆز و چاکتر بزانیٚ، هەروەك شەیتان وتی: (خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ) پێغەمبەر ﷺ ئەو یەکسانییەی بڕیوەتەوە بەفەرمودەی: (کلکم من آدم وآدم من تراب)، واتە: کەس خۆی بە گەورە و بەنرخ نەزانیٚ، چونکە هەمووتان لە ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵە.. لە فەرموودەیەکی تریشدا ئەفەرمویٚ: (انما النساء شقائق الرجال)[11] واتە: ئافرەتان لەتی پیاوانن، کەواتە بەهەردوو لەتەکەوە مەبەست لە**

[10] سورەتی حجرات ئایەتی (١٣)

[11] رواه عن عائشه أحمد (٦/ ٢٥٦)، وابوداود (٢٣٦)، والترمذي (١١٣)

دروست بوونیان ئەهێننە دی کە بەردەوامیدانە بە ژیان و هەموو جیاوازییە ڕەگەزی و ئایدۆلۆژی و بایلۆژییەکان لە بۆسەی زاراوەی (یاایها الناس)دا دەتوێتەوە..

کەواتە پێوەر بۆ ڕێزو بەها و مافی هەر مرۆڤێك بەپلەی یەکەم بە مرۆڤ بوونەکەیەوە بەستراوە نەك بە پێوەری لاوەکی و نادروستەوە، پاشان لە ڕوانگەی لەبەرچاوگرتنی سروشت و پێویستییەکانی هەر ڕەگەزێك بە شێوەیەکی گشتی ماف و ئەرکەکانی بۆ دیاریی کراوە، هەروەکو ئەم سەردەمەی خۆمان کە سەردەمی ئیداریاتە و پێویستە ڕێبازی (الأنسان المناسب في المكان المناسب) لەبەرچاو بگیرێ، بۆ ئەوەی بەردەوامی بە ژیان بدرێ و ناڕێکی و دژایەتی کردن لەگەڵ فیترەو بوونەوەردا نەکرێ، تا ژیان خولگەی تایبەتی خۆی وەرگرێ و ئەو پەیوەندییە بەهێزەی کە لە نێوانیاندا هەیە بپارێزرێت کە پەیوەندییەکە لەسەر بنەما و پڕەنسیپی سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی دروست بووە (هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ) (یونس: ٦٧).

خوای گەورە خۆشەویستی خستۆتە نێوان پیاو و ژنەوە و پەیوەندیی نێوانیان لەسەر دوو بنەمای سەرەکی دائەمەزرێنێت کە خۆشەویستی و بەزەییە، نەك ململانێ و پیلان بۆ یەك دروست کردن، گومان لەوەدا نییە کە ئەو دوو ڕەگەزەش لە خێزانێکدا خۆیان ئەبیننەوە.. کە ئەو خێزانەش گەورەترین گرنگترین دەزگایە لەم بوونەوەرەدا و هەرچی دەزگاکانی تری بازرگانی و پیشەسازی و... هتد. لە خزمەتی دەزگای خێزاندان کە بەرهەمهێنەری مرۆڤە.. هەروەکو وتمان ئیسلام گرنگییەکی زۆری بە خێزان داوە و کارەکانی بۆ ڕێك خستووە و ماف و ئەرکەکانی هەریەك لە ژن و مێردی دیاریی کردووە تا بتوانن بە شێوەیەکی دروست ئەرکەکانیان لەو دەزگایەدا جێبەجێ بکەن.

بۆ نموونە: لە فیترەت و دروست بوونی ڕەگەزی ژندا دڵ نەرمی و سۆز و بەزەییو هەڵچوون و خێرا بەدەمەوەچوونی منداڵ هەیە بەبێ بیرکردنەوە و دواخستنی کە بە حوکمی کارەکەی واپێویست ئەکات.. دیارە بوونی ئەم سفەتانەش سروشتین و لە ناخی دروست بوونی خانەکانی مێشك و جەستە و دەرونیدایە و یارمەتیدەریەتی بۆ

ئەوەی بتوانێ بە کاری سکپڕی و منداڵبوون و شیرپێدان و پەروەردە و پێگەیاندن هەڵسێت کە گەورەترین و ترسناکترین کارە و پێویستییەکی ئێجگار زۆری بە کەش و هەوایەکی لەبار هەیە بۆ ئامادەکردنی باری دەرونی و جەستەیی و ژیری ئەم ئافرەتە تا منداڵ و نەوەیەکی ڕەسەن و دروست بەرهەم بهێنێت.

جا با بزانین کێ بە پلەی یەکەم بەرپرسیارە لە دروستکردن و فەراهەمهێنانی ئەم کەش و هەوا لەبارە بۆی؟

ئاشکرایە کە خوای گەورە و کاردروست ڕەگەزی پیاوی بە شێوەیەك دروست کردووە کە بتوانێ ئەو کەش و هەوا لەبارە دروست بکا و یارمەتیدەر و تەواوکەری ئەو ژنە بێت لەو بەرهەمهێنانەدا بەو کۆمەڵە سیفاتەی کە توانای پارێزگاری (حماية) کردنی لەو خێزانە هەیە و بەهێزترین سەنەد و پشتیوانیش بێت بۆ ئەو ژنە.

بۆ نموونە: دابینکردنی خانووبەرەیەکی وەها کە مایەی حەوانەوەی بێت و هەرچی پێداویستییەکی بەڕێوەبردنی ئەو ماڵە هەیە بیخاتە بەردەستی بەپێی توانا و دەسەڵاتی، هەروەها گرنگترین وەزیفەیەك کە ئەو ژنە بێ غەم بکات لێی پەیداکردنی بژێوییە بۆ ئەو خێزانە بە هەر وەسیلەیەك بێت. دیارە گرتنە ئەستۆی ئەم کارانەش پێویستی بەو سیفاتانە هەیە کە لە پیاودا دروستی کردووە وەك: خۆگری و ئارامی و حیکمەت و دانایی بە شێوەیەك کە بتوانێ ئیدارەی خێزانەکەی بداو لە هەڵوەشان و تیاچوون بیانپارێزێت. هەروەها ئەو هێز و توانا جەستەییەی کە توانای گرتنە دەست و ژێربارخستنی هەموو کارێکی هەیە.. نکوڵی لەوە ناکرێت کە زۆربەی ڕەگەزی نێرینە خاوەنی ئەو سیفەتانەیە ئەگەر بتوانێ بە شێوەیەکی دروست بەکاریان بهێنێ.

کەواتە لێرەدا عەدل و دادی خوای گەورەمان بۆ دەردەکەوێت کە ژنان بە هەموو لێبڕانێکییەوە بەو کارە گرنگە هەڵدەستێت کە بەرهەم هێنانی مرۆڤێك و پێویستیشی ئەکات لەسەر پیاوان کە ژیانیان بۆ دابین بکەن و هەموو کەموکوڕییەکانیان بۆ پڕ بکەنەوە بەبێ ئەوەی رێگەی پێ بدرێت سنوور ببەزێنێ و پیادەی زوڵم و ستەم و خۆبەگەورەکردن بکات لەناو خێزانەکەیدا (خيركم خيركم لأهله وأن خيركم لأهلي)،

ئەمەیە ئەو قەوامە و فەزڵەی کە خوای گەورە پێشکەشی پیاوانی کردووە کە پڕیەتی لە مەسئولیەت و بەرپرسیارێتی.
با ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە لە شەریعەت و یاسای ئیسلامدا ئافرەت بۆی هەیە لە کار و کەسابەت و مامەڵەکردندا ڕۆڵی خۆی ببینێ و ببێتە گەورەترین بازرگان، هەروەکو خوای گەورە ئاماژە بەو شیاوی و لێهاتوویيەی ئافرەتیش ئەکات کە توانای بازرگانی کردنی هەیە، ئیتر ئەو بازرگانییە گەورە بێت یا بچوك، گرنگ ئەوەیە لە کاری حەلاڵ دەرنەچێ و نرخ و ڕێزی ئافرەتەکەی تێدا پارێزراو بێت (لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ) (النساء: ٣٢) واتە: بۆ پیاوان هەیە پشك و بەش لەو دەرامەتەی کە بەدەستی دەهێنن، بۆ ئافرەتانیش هەیە پشك و بەش لەو ماڵ و دەرامەتەی کە بەدەستی دەهێنن، لەهەمان کاتیشدا بژێویی هیچ کەسێکیشی لە ئەندامی خێزان و خزم و کەس و کاری نەخراوەتە سەر، بەڵکو خۆی بەدەستی خۆی توانای بەکاربردن و بەکارهێنانی هەیە، بەبێ ئەوەی پیاو مافی دەستتێوەردانی ئەو موڵك و ماڵەی ژنەی هەبێت.. بە پێچەوانەی وڵاتانی ئەوروپا کە لافی ئازادی و سەربەستی و یەکسانی لێدەدات، کەچی بەپێی یاسای فەڕەنسی هیچ ئافرەتێك بۆی نییە بەبێ ئامادە بوون و ڕازی بوونی مێردەکەی کارێك لە کارەکانی بازرگانی وەك کڕین و فرۆشتن و ڕەهن و گرێبەستێك ئەنجام بدات.[١٢]
ئەو مافی کارکردنەش کە لەو وڵاتانەدا پەرەی پێدراوە لەسەر بنەمای (من لا يعمل لا يأكل) واتە: هەرکەسێك کار نەکات نان نییە بیخوات)، دایك لەو وڵاتانەدا بە ئەعسابێکی سەرقاڵ و ماندووەوە ئەبێت ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانی هەڵبگرێت، بە پێچەوانەی ئافرەتی موسڵمانەوە کە بە مێشکێکی سارد و ئیسراحەتەوە ئەو ئەرکە ئەنجام ئەدات، کەواتە ئەو بژێوییەی کە ئیسلام وەك مافێك پێشکەشی ئافرەتانی کردووە، ئەمان لای دادەڕنن و لێی دەسێننەوە و بە ئەرکی دەزانن، ئەو بژێوییە لەسەر خۆیانە و پێویستە بەدەستی بهێنن ئەگەر لەسەر حسابی لەشفرۆشییش بێت (پەنا بە خوا)، کەواتە لێرەدا تەنها ئافرەتان زەرەرمەندن بەوەی کە دوو ئەرکی زۆر

[12] في ضلال القرآن، سيد قطب، ج٢، ص ٦٤٥.

گەورەیان لە ئەستۆدایە، ئەرکی دایکایەتی و پاشان ئەرکی کارکردن لە دەرەوە بە مەبەستی نان و بژێوی پەیداکردن.. ئیتر ئەبێ لێرەدا چ ئەرکێك لەسەر پیاوان بێت بەرانبەر بە ژنەکانیان؟ بێگومان تەنها پیاوان خاوەنی مافن و ئافرەتانیش خاوەنی ئەرك، ئەمە ئەو سەربەستی و یەکسانی و ئازادییەیە کە لە وڵاتانی غەیرە ئیسلامیدا بەرچاو دەکەوێت و ئافرەتانی دونیای موسڵمانیشی پێ غافلگیر ئەکەن و وایان پێ ئەسەلمێنن کە ئەوان خۆشبەخت و ئەمان بەدبەخت!

٨ نووسەر ئەڵێت: "شەش ساڵ پاش مردنی خەدیجە و دوای شەڕێکی خوێناوی لە نێوان موسڵمانەکان و خێڵە دەسەڵاتدارەکانی مەککەدا. کە بووە هۆی بێوەژن کردنی شەست و پێنج ژنە موسڵمان، موحەممەد ئایەتێکی بۆ دێتە خوارەوە کە تێیدا هانیان دەدا بۆ مارەکردنی ژنان تا ئاستی چوار ژن".[13]

لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەم قسەیەی نووسەر پڕە لە نەزانین و بێویژدانی، چونکە ئەوەی زانراوە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً) (النساء: ٣) زۆر دوورە لەوەی ئەو ئەیڵێت و بۆی ئەچێت، سەرەتا ئەتوانین بڵێین بە نووسەر و وەرگێڕ کە هەر بە تەماشاکردنی ئایەتەکە ئەبوایە بیزانیایە کە هیچ پەیوەندییەکی نییە بەو شەڕە خوێناوییەوە کە ئەو ئاماژەی پێ دەکات، بەڵکو بەرگری و پارێزگاری کردن بوو لە مافی ئەو کچە بێ باوکانەی کە لە ژێر ڕکێفی کەسێکی تردا بوون.

وەك مام و ئامۆزا، خاڵ... هتد، یا ئەم ڕاستیەش بسەلمێنین: عوروەی کوڕی زوبێر پرسیاری کرد لە دایکمان عائیشە ﵂ دەربارەی ئەم ئایەتەی کە خوا ئەفەرموێ: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ) (النساء: ٣). یانی (خۆ ئەگەر ترستان بوو لەوەی کە دادپەروەر نەبن لەگەڵ کچە بێ باوکەکاندا)، عائیشە فەرمووی: ئەی خوشکەزای خۆم خوای گەورە لێرەدا مەبەستی ئەوەیە ئەو کچە بێ باوکە وا

[13] لاپەڕە (١١)ی کتێبی (کچانی خوا)

**لەژێر ڕکێفی سەرپەرشتیارەکەیدا و بەشداره لە ماڵەکەیدا، لە هەمان کاتیشدا سەرسام و موعجەب بوو بە جوانی و ماڵەکەشییەوە، هەر بۆیە سەرپەرشتیارەکەی ئەیویست مارەی بکات بەبێ ئەوەی مافەکانی لە بەرچاو بگرێ وەك مارەیی و پێداویستەکانی هاوسەرگیریی) کە ئافرەتانی تر پێویستیان ئەکرد لەسەری، بۆیە خوای گەوره ئەم کارەی یاساغ و قەدەغە کرد،تاوەك ئافرەتانی دیکە مافەکانی لەو پرۆسەی هاوسەرگیرییەدا دەستەبەر نەکرێ، ئەگەر بەم شێوەیە نەتانتوانی مافەکانیان بپارێزن بچن ئافرەتی جگە لەوان بخوازن لە یەك ژنەوە تا چوار ژن..[14] لەوە زیاتر بۆتان نییە سنور ببەزێنن.**

**پاشان هەر لە سیاقی ئایەتەکەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە خوای گەوره بەم ئایەتەش فرەژنی سنووردار کردووە، کە پیادەکردنی یاسای فرەژنی یاسایەکی باو بووە و بە شێوەیەکی ڕەها ئەنجام دراوە و سنووری نەبووە لە سەرجەم شارستانییەتەکانی پێش هاتنی ئاینی ئیسلامدا، بۆ نموونە: لە چین دا پیاو بۆی هەبووە ژمارەیەکی زۆر ژن بهێنێ بە خاتری زۆر بوونی منداڵ، هەروەها لە شارستانیەتی ڕۆمان و یۆناندا ئەمە هەر باو بووە، ئیمپراتۆر (سیلا) پێنج ژنی هەبووە و قەیسەر خاوەنی چوار ژن بووە بێجگە لەوەی بە نا شەرعی و نادروست پەیوەندییان بە چەندین ژنی ترەوە هەبووە.**

**یان لە ئاینی جولەکەکاندا رێ بەو یاسای فرەژنییە دراوە و سنوورێکیش نەبووە لە بەردەم پیاواندا، هەروەها لە ئایینی گاورەکاندا تەنها یەك دەق نییە لە ئینجیلدا کە ڕێگریی لە فرەژنی کردبێت، لە کتێبی (المرأة في القرآن)ی عەبباس مەحمود عەققاددا ئەڵێت: "وستر مارك" کە زانایەکی باوەڕپێکراوە لە مێژووی هاوسەرگیرییدا ئەڵێت: بە ئیعترافی کەنیسە یاسای فرەژنی تا سەدەی حەڤدەهەم ماوەتەوە و پاشانیش لە زۆر**

---

[14] لە کتێبی (صفوة التفاسیر) لە نووسینی (محمد علي الصابوني) ج١، لە لاپەرە (٣٩٣) ئەڵێت: عن عروة بن الزوبير أنه سأل عائشة عن قول الله تعالى (وان خفتم ألا تقسطوا في اليتامي) فقالت: ياابن اختي هذه اليتيمة تكون في حجر وليها تشركه في ماله ويعجبه مالها وجمالها فيريد وليها أن يتزوجها بغير أن يقسط في صداقها فيعطيها مثل مايعطيها غيره، فنهوا من ذلك الا أن تقسطوا لهن ويبلغوا لهن على سنتهن في الصداق، فأمروا ان ينكحوا ماطاب لهم من النساء سواهن.

بارودۆخدا بەردەوامی هەبووە بە شێوەیەك کە نە کەنیسە و نە دەوڵەتیش نەیانتوانیوە سەرژمێری بکەن.

هەروەها لەناو عەرەبەکانی دوورگەی عەرەبیدا بە هەمان شێوەی گەلانی تر خویەکی بەربلاو بووە تیایاندا و زۆرینەی خەڵك لەو ڕۆژگارەدا بەبێ سنوور ژنی هێناوە و هیچ ڕێگر و بەربەستێك نەبووە لە ئاست هەوا و ئارەزوویاندا و بە هەر شێوەیەك بۆیان لوابێت درێغییان نەکردووە.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە یاسای فرەژنی یاسایەکی مێژووییە و هەر لە کۆنەوە لەناو گەلانی جیهاندا باو بووە، نەك بە بۆچوونی نووسەر کە ئاگای لەم ڕاستییە نییە، یان ئاگادارە و بێویژدانی ئەکات کە ئەمە یاسایەکی تازە بێت و ئیسلام هێنابێتی.. نەخێر، بەڵکو ئیسلام کە هات بەم ئایەتە پیرۆزە سنووورداری کرد، ڕێکی خست بە شێوەیەك کە ببێتە چارەسەر و دەرمان بۆ هەندێ لەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییانەی کە کۆمەڵگاکان پێوەی دەناڵێنن.

ئەوەتا قەیسی کوڕی سابت ئەڵێت: کاتێ کە موسڵمان بووم، خاوەنی هەشت ژن بووم، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم بە هەڵبژاردەنی چواریان و دەستبەردار بوونم لە چوارەکەی تر.

یا غەیلانی کوڕی سەلامی سەقەفی کە موسڵمان بوو، دە ژنی هەبوو، هەر بەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد چواریان بهێڵێتەوە و دەست لەوانی تر هەڵبگرێت.

دیارە ڕێگەدان بە یاسای فرەژنی لە ئیسلامدا کۆمەڵێك هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە کە گرنگترینیان (عەدلو نەفەقە)یەو پاشانیش سنووردار کردن و بەرگرتنە لەو هاوسەرێتییەی کە بە شێوەیەك ڕەها و ئەنجام دەدرا و بەرگرتن بوو لە داڕووخانی کۆمەڵگای بەشەریەت و لە بەین نەبردنی بەها ڕەوشتییەکانی ناو کۆمەڵگا و بەرگرتن لەو لێشاوە بەدڕەوشتییەی کە لە ئەنجامی پەیوەندیی ناشەرعییەوە لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە بێ لەبەرچاوگرتنی مافەکانی ژنان و حسابکردن بۆ چارەنووس و داهاتوویان.

٩. نووسەر لە هەمان پەرەگرافدا ئەڵێت: "بۆ دروستكردنی بەرە لە ڕێگای ژن هێنان و شوو كردنەوە لەگەڵ دوژمنانی تێكشكاودا، موحەممەد ئایەتێكی تری بۆ دێتە خوارەوە كە لە بازنەی ئاستی چوار ژن زیاتر مارەكردن خۆی قوتار دەكات". [15]

لە وەڵامدا ئەڵێین: پێغەمبەر ﷺ خۆی دەرباز نەكردووە لە ئایەتی چوار ژنە، بەڵكو:

١. بۆ پێغەمبەر ﷺ نەئەكرا دەسبەرداری هیچ كام لە خێزانەكانی تری ببێت، چونكە دایكی ئیمانداران بوون و بۆ كەس ڕەوا نەبوو بیانخوازێتەوە و لە ئەنجامدا بێ سەرپەشت ئەمانەوە. ئەم كارەش ئەبووە ستەمێك دەرهەقیان، بە پێچەوانەی ئافرەتانی ترەوە كە بۆیان هەبوو شوو بكەنەوە بەهەر كەسێك كە بیانویستایە، (وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً). [16]

واتە: ئێوە بۆتان نییە ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدەن و ژنەكانی دوای خۆی مارە بكەنەوە، كەواتە مارەكردنەوەی ژنی پێغەمبەر ﷺ پاش خۆی لەسەر ئیمانداران حەرام كرا، ئەوە هۆیەكە بۆ ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ، پاشان ژنانی پێغەمبەر دایكانی ئیماندارانن و پێویستە وەك دایك سەیر بكرێن و ڕێزی دایكایەتییان لێ بگیرێت.

بەڵام پاش ئەوەی یاسای فرەژنی سنووردار كرا بۆ چوار ژن ئیتر پێویست كرا لە سەر پێغەمبەریش ﷺ كە دەست بگرێ بە خێزانەكانییەوە.

واتە: نە زیادی بكات، نە دەستبەرداری كەسیشیان ببێت، هەروەكو خوای گەورە ئەفەرموێ: (لَا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ...) [17] واتە: لە پاش ئەمانەی كە هاوسەرتن، بۆت حەڵاڵ نییە ئافرەتانی تر بهێنیت، یان بیانگۆڕیت بە ئافرەتانی تر...

---

[15] لاپەڕە (١١)ی كتێبی (كچانی خوا)

[16] سورەتی ئەحزاب ئایەتی (٥٣)

[17] سوورەتی ئەحزاب ئایەتی (٥٢)

دایکی ئیمانداران عائیشە رضي الله عنها ئەفەرموێ: ئەم قەدەغەکردنە پێش لە دونیادەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لابراو سڕایەوە و سەربەست کرایەوە، بەڵام پاش ئەوەش کەسی تری هەر نەهێنا..[18]

سەبارەت بە ژمارەی خێزانەکانیشی بێگومانین لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە درێژایی تەمەنی پیرۆزی خاوەنی یازدە ژن بووە، کە دوانیان هەر لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ کۆچی دواییان کردووە، کە خاتوو خەدیجە و زەینەبی کچی خوزەیمە بوون (ڕەزای خوایان لێ بێت)، بەڵام نۆ خێزانەکەی تری لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ئەمێننەوە و تا تا چەند ساڵ پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خواش ﷺ.

هەر لە هەمان پەرەگرافدا باس لە هۆکاری ژن هێنانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەکات کە گوایە لە پێناو دروستکردنی بەرەدا بووە بەرانبەر بە دوژمنی تێکشکاو، یاخود لە لاپەڕە (١١٢)ی کتێبەکەیدا ڕەخنەی غەیرە ئیسلامییەکان ئەهێنێتەوە کە گوایە موحەممەد پیاوێکی حەشەر بووە (حاشاە) و بە هۆی زیاتر بوونی ڕێز و دەسەڵاتی ئەو توانایەی پێداوە کە پاش مردنی یەکەم ژنی دوای هەوەس و ئارەزووی خۆی بکەوێت..

سەرەتا بەرلەوەی بچینە ناو باسی هۆکارەکانی فرەژنی پێغەمبەر ﷺ، چەند ڕاستییەك هەیە پێویستە بیزانین:

١- پیادەکردنی یاسای فرەژنی خوویەکی بەربڵاو بووە لە مێژووی گەلان و میللەتانی دونیای پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

٢- ژن هێنانەکانی پێغەمبەر ﷺو کۆکردنەوەیان لەیەك کاتدا لە مەدینە و لە تەمەنی پیرێتیدا بوو..

ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ دوای مردنی خاتوو خەدیجە رضي الله عنها بێجگە لە سەودەی کچی زەمعە کە ئافرەتێکی بە تەمەنی (٥٥) ساڵە بوو، هیچ ئافرەتێکی تری نەخواست تا کۆچی کرد بۆ مەدینە و کۆمەڵێك مەبەستی یاسایی و مرۆیی و چاکسازی وابەستەی ئەو فرەژنییەی کرد..

[18] تەفسیری سێ سوورەت —ئامینە صدیق عەبدولعەزیز- لاپەڕە (٢٨٢)

**کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ خاتوو خەدیجەی مارە کرد تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو، نزیکەی (١٥) ساڵ لە خاتوو خەدیجە منداڵتر دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا بێوەژن بوو، واتە دوو شووی تری پێش ئەم کردبوو، پاش مردنی ئەم بەڕێزەش سەودەی کچی زەمعە مارە ئەکات کە پیرەژنێکی (٥٥) ساڵە بوو بە مەبەستی دالْدەدانی..**

**ئایا بۆ هیچ مرۆڤێکی ژیر و دانا شایانە دان بەوەدا بنێت کە هەوەس و ئارەزووبازیی پاڵنەری فرەژنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بوو بێت کە سەرەتای تەمەنی لاوێتی لەگەڵ دوو ئافرەتی بێوەژنی زۆر بەتەمەن تر لە خۆی بەسەر بردبێت، ئەی ئەو ئافرەتانەی تر کە لە تەمەنی (٥٠) ساڵ بەرەو ژوورتر و لە شاری مەدینەدا ئەیانخوازێت، کۆمەڵێك ئافرەتی بێوەژن و هەژار و لێقەوماو نەبوون جگە لە خاتوو عائیشە؟ (رەزای خوایان لێ بێت)، هەر بۆیە بەپێویستی ئەزانم بە کورتی و لە چەند خاڵێکدا کورتەی ژیان و هۆکاری خواستنی هەریەك لەو ژنانە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بخەمە بەر دیدەی خوێنەرانی کورد تا ئەوە بزانن کە:**

**١- پیادەکردنی یاسای فرەژنی لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ قوربانیدانێك بوو بە ژیانی خۆی لەپێناو بەرزڕاگرتن و پاراستنی ئەو پەیامەی کە لە ئەستۆیدا بوو، نەك بە پێچەوانەوە کە دوژمنانی ئەیانەوێت بوختانی بۆ بکەن گوایە حەز و ئارەزووبازیی تێیدا باڵادەست بووە!**

**٢- نووسەر و وەرگێڕ بێویژدانییان بەخەرج داوە و ئاگایان لە مێژوو نییە، ئەدەبی قسەکردنیان ریعایەت نەکردووە لە بەکارهێنانی وشەی (حەشەری) بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ کە بێ نرخی و بێ ئەرزشی کەسایەتی نووسەر یان ڕاستتر وەرگێڕ دەردەخات کە فێری ئەوە نەبووە مامەڵەی عاقڵانە لەگەڵ پیاوی گەورەدا بکات و دەمپیس نەبێت بەرامبەریان.**

**٣- بینشێکی ڕوون بێت لەو چەمکە ئیسلامیانە و وەڵامی گومان و پرسیارەکانی ناحەزان و نەزانەکانی تێدابێت لەو پرسە هەستیارەدا.**

**هەروەها سەبارەت بە بۆچوونەکەی تری نووسەر کە موحەممەد لە ڕێگای فرەژنییەوە توانیوێتی بەرە بەرانبەر بە دوژمن دروست بکات.**

ئه‌ڵێین نكوڵی له‌وه‌ ناكرێت كه‌ یه‌كێك له‌ هۆكاره‌ گرنگه‌كانی پیاده‌كردنی یاسای فره‌ژنی له‌ لایه‌ن پێغه‌مبه‌ری خواوه‌ ﷺ دروستكردنی به‌ره‌و به‌هێزكردنی په‌یوه‌ندیی له‌ نێوان هاوه‌ڵاندا بوو، دیاره‌ ئه‌م كاره‌ش گاڵته‌ی پێناكرێت و گرێدانی كۆمه‌ڵگه‌ مرۆییه‌كان پێكه‌وه‌ سه‌روه‌رییه‌ نه‌ك شه‌رمه‌زاریی، به‌م كاره‌ش به‌رهه‌می خۆی دا به‌ ده‌سته‌وه‌ كه‌ توانی له‌ ماوه‌یه‌كی كه‌مدا ئیمپراتۆرییه‌تێكی ئیسلامی دروست بكات و زۆرترین گه‌لان و كۆمه‌ڵگه‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ بكاته‌ برا و خزم دۆستی یه‌كتری.

## مه‌به‌ست و هۆكاری تریشمان زۆره‌ له‌ پیاده‌كردنی ئه‌م یاسایه‌ له‌ لایه‌ن پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ كه‌ ئه‌توانین ئاماژه‌ به‌ هه‌ندێكیان بده‌ین كه‌:

## یه‌كه‌م: به‌دیهێنانی به‌رپرسیارێتی (تحقيق التكامل):

بێگومان یه‌كێك له‌و هۆیانه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ وابه‌سته‌ی فره‌ژنی كرد، هه‌ست كردنی بوو به‌و به‌رپرسیارێتییه‌ی كه‌ به‌رانبه‌ر شوێنكه‌وتوانی بووی وه‌ك خواستنی:

١ـ سه‌وده‌ی كچی زه‌معه‌ رضي الله عنها كه‌ خێزانی ئامۆزایه‌كی خۆی بوو به‌ ناوی سه‌كرانی كوڕی عه‌مر، هه‌ردووكیان له‌ موسڵمانه‌ پێشینه‌كانی مه‌ككه‌ بوون و یه‌كێك بوون له‌و خێزانانه‌ی كه‌ به‌ خۆیان و دینه‌كه‌یانه‌وه‌ كۆچیان كرد بۆ حه‌به‌شه‌ و هه‌ر له‌وێ و له‌و غه‌ریبییه‌دا هاوسه‌ری باوه‌ڕداری كۆچی دوایی ده‌كات و (سه‌وده‌)ش به‌بێ داڵده‌ ئه‌مێنێته‌وه‌ و به‌ ته‌نها ئه‌گه‌ڕێته‌وه‌ شاری مه‌ككه‌، دیاره‌ ترسێكی زۆریشی هه‌یه‌ له‌ لایه‌ن كه‌س و كارییه‌وه‌، كه‌ ئه‌یانویست تووشی پاشگه‌زبوونه‌وه‌ی بكه‌ن له‌ دین، یا ڕووبه‌ڕووی ئازار و ئه‌شكه‌نجه‌ و كوشتن ببێته‌وه‌، كۆمه‌ڵی موسڵمانانیش هه‌میشه‌ له‌ غه‌م و به‌ده‌مه‌وه‌ چوونی یه‌كترییه‌وه‌ ئه‌ژیان، ئه‌وه‌بوو یه‌كێك له‌و ئافره‌ته‌ خێرخواز و لێهاتووانه‌ كه‌ ناوی خه‌وله‌ی كچی حه‌كیمه‌ بیرۆكه‌ی شووكردنی سه‌وده‌ به‌ پێغه‌مبه‌ری خوای ﷺ بۆ دروست ئه‌بێت تا به‌ تیرێك دوو نیشانه‌ بشكێنێت، له‌لایه‌ك غه‌مخواردنی به‌ڕێوه‌بردنی ماڵی پێغه‌مبه‌رو سه‌رۆكاری كردنی كچه‌كانی، ده‌سته‌به‌ر بكات‌و له‌ لایه‌كی تره‌وه‌ سه‌وده‌ دابمه‌زرێنێت و ڕزگاری بكات له‌و ته‌نهایی و

دڵەڕاوکێیەی کە تێی کەوتووە، هەر بۆیە بە هەلی ئەزانێ و ئەچێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و باسەکەی لە لا ئەدرکێنێ، باسی ئەوە ئەکات کە سەودەی کچی زەمعە یەکێك بوو لە باوەڕدارە پێشینەکان و هەر زوو باوەڕی پێ هێناویت و ئێستا پێویستی بە یارمەتی هەیە کە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەیت و ڕزگاری بکەیت، لە هەمان کاتیشدا ئەتوانێت سەرۆکاری ماڵ و منداڵەکانت بکات..

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەزامەندی دەربڕی و قایل بوو بەوەی کە مارەی بکات، هەرچەندە ئەم ژن هێنانەی پێغەمبەر ﷺ بووە جێگای پرسیار و تێڕامانی زۆرینەی قوڕەیشییەکان کە چۆن پێغەمبەر ﷺ قایل بوو بە ئافرەتێك کە زۆر بە تەمەن و هەیکەل و ڕەش و ئەسمەر، بە شێوەیەك کە سەرنجڕاکێش نەبووە تا بتوانێ شوێنی خاتوو خەدیجەی پێ پڕ بکاتەوە، کە خەدیجە یەکێك بوو لە ئافرەتە ناودارەکانی قوڕەیش و جێی سەرنجی سوارچاکانی قوڕەیش بوو، هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ نە سەودە و نە هیچ ئافرەتێکی تری تەنانەت عائیشەش (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەوە نەدەزانی کە جێگای خاتوو خەدیجەی بۆ پڕ بکەنەوە، تەنها ئەوە نەبێت قەرەبوو کردنەوەی ئەو باوەڕ و لێبڕانییەی بوو بۆ ئیسلام و هەست بە بەرپرسیارێتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بەرانبەر بە شوێنکەوتوانی، سێ ساڵ بەر لە کۆچکردنی بۆ مەدینە هاوسەری بوو تا کۆتایی تەمەنی پێغەمبەر و پاشانیش لە کۆتایی فەرمانڕەوایەتی ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه گیانی بەخوای خۆی سپارد.

٢ـ زەینەبی کچی خوزەیمە رضي الله عنها کە خێزانی یەکێك لە سوارچاك و خانەدانەکانی قوڕەیش بوو بە ناوی (عوبەیدەی کوڕی حارس)، ئەو عوبەیدەیەی کە لە شەڕی بەدردا لەگەڵ حەمزەی کوڕی عبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرانبەر بە گەورە پیاوانی قوڕەیش: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە جەنگاو بە حوکمی بنەماڵە و خانەوادە هەموویان هاوشانی یەکتر بوون، پاش ئەوەی عوتبە و شەیبە و وەلید کوژران، عوبەیدەش بریندار بوو بە شێوەیەك قاچێکی لەدەست داو بڕییانەوە، پێغەمبەریش ﷺ زۆر دڵنەوایی کرد و مژدەی بەهەشتیشی دایە، ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێك بە پلەی شەهادەت گەیشت رضي الله عنه.

زەینەب کە ئافرەتێکی بە ئارام و خۆگر بوو، هەمیشە چاوەڕێی پاداشتی خوایی ئەکرد بە ئایەتی (الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ * أُولَـئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ) (البقرة: ١٥٦ـ ١٥٧) پێشوازیی لەو موسیبەتە سەختە کرد و داوای لێخۆشبونی خوایی بۆ هاوسەری خۆشەویستی ئەکرد. بەڵام پاش تەواو بوون (عیدە)کەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی ئەکات و ئەیکاتە دایکی باوەڕداران و هاوسەر و هاوەڵی خۆی.

ئەم خاتوونە لە سەردەمی نەفامیدا لەبەر سۆز و ئەو هاوکاریانەی کە بەرانبەر هەژاران هەیبوو، پێیان ئەوت: (أم المساكين) واتە: دایکی هەژاران، هەر لەسەر ئەو کارەشی بەردەوام بوو تا کۆتایی بە تەمەنی پیرۆزی هات، هەندێك ئەڵێن تەنها دوو مانگ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ژیاوە و هەندێکی تر دەڵێن هەشت مانگ ژیاوە و بە هۆی کەمی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێڕاوەتەوە..

### ٣ـ ئوم حەبیبە (ڕەملە کچی ئەبو سوفیان) رضي الله عنها.

ئاشکرایە کە ڕەملە کچی ئەبوسوفیانی گەورە و سەرداری قوڕەیش و سەرجەم بێباوەڕان بوو، خێزانی عوبەیدوڵلا ی کوڕی جەحش بوو، ئەم دوو هاوسەرەش یەکێك بوون لەو خێزانانەی کە لە دەست زوڵم و ستەم و ئەشکەنجەی قوڕەیشییەکان کۆچ ئەکەن بۆ حەبەشە، ماوەیەك لەوێ ئەمێنێتەوە، پاش ماوەیەك خوای گەورە کچێکیان پێ ئەبەخشێ و ناوی ئەنێن (حەبیبە)، هەر بۆیە ڕەملە لە دواییدا بەو ناوەوە ناسراو نازناوی (ئوم حەبیبەی) وەرگرت و بەو ناوەوە بانگی لێ دەکرا..

ئوم حەبیبە تا بڵێی ئافرەتێکی ئازاو لێهاتوو بە ئارام بووە بەرانبەر بەو هەموو غەریبی و بێ دەسەڵاتی و نەبوونییەی کە لە پێناوی ئاینەکەیدا ڕووبەڕووی دەبوویەوە، لەسەروو ئەمانەشەوە گەورەترین تاقیکردنەوەیەك کە هاتەڕێی لەو وڵاتی غەریبی و بێ کەسیەدا، پاشگەزبوونەوەی مێردەکەی بوو لە ئایینی خوا و پێغەمبەر ﷺو بوونی بە گاور، دیارە مێردەکەی هەر بە گاوربوونی خۆشیەوە نەوەستا، بەڵکو هەوڵی دەدا کە ئوم حەبیبەش وەك خۆی لە دین وەرگێڕێ، بەڵام هەوڵەکانی بێ بەرهەم بوو، پاشان کۆتا هەوڵی خستەکار بەوەی کە یا ئەبێ ئوم حەبیبە ببێتە گاور

یا ئەبێ تەڵاقی بدا و لێی جیاببێتەوە، لەڕاستیدا هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو کارە خەڵکی خۆی دەوێت کە بتوانێ لەبەردەمیدا بوەستێ و هەڵوێست وەربگرێ، بەڵام نەبەردی و قارەمانی (ئوم حەبیبە) لەوەش گەورەتر بوو، کە وەك مرۆڤێکی خۆڕاگری خاوەن بیروباوەڕێکی پتەو، خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبژێرێ و دەست بگرێ بە ئاینەکەیەوە و دەستبەرداری مێردی لە خوا یاخی بووی ببێت، کە لە ڕاستیدا کەسایەتییەکی کەموێنە بوو، چونکە کەم کەس ئەیتوانی ئەو هەڵوێستە بنوێنێ لەو وڵاتی غەریبی و بێ کەسییەدا، بەڕاستی جێگای شانازییە بۆ هەموو ئافرەتێکی باوەڕدار کە ئەم خاتوونە بەڕێزە بکاتە سەرمەشق و نموونە بۆ خۆی و دەوروبەرەکەی.

(ئوم حەبیبە) ڕۆژانی پڕ لە مەینەت و غەریبی و دوور لە کەسو کار و بێ ماڵ و مێردی بردە سەر، تا خوای گەورە دەرووی پڕ خەیری لێ کردەوە و واتاکانی ئەم ئایەتەی بۆ کردە دیاری (وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً * وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ). واتە: لەهەر جێیەکدا هەرکەس لە خوابترسێ، خوای گەورەش دەروی لێ ئەکاتەوە و لە شوێنێکەوە ڕۆزی بۆ ئەنێرێت کە هەر حسابیشی بۆ نەکردبێ، ئەوە بوو ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺو ئەویش کەوتە خەیاڵی غەم خواردنی، ئینجا نەیهێشت زۆری بەسەردا بچێت نوێنەری ناردە لای پاشای حەبەشە کە بە وەکالەت خوازبێنی ئوم حەبیبەی بۆ بکات، ئەگەر ڕازی بوو ئەوا هەر لەوێوە بۆی مارە بکات.

(نەجاشی) کە پاشای حەبەشە بوو خێرا بەدەم داواکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ڕۆیشت و کەنیزەکێکی خۆی ناردە لای ئوم حەبیبە و ڕاسپاردەکەی پێغەمبەریان پێگەیاند، کاتێ کە ئوم حەبیبە لە ڕاستیی هەواڵەکە گەیی و دڵنیابوو، یەکسەر هاواری کرد و وتی بە کەنیزەکە: کە خوا موژدەی خۆشت بداتێ، دەستی برد هەرچی ئاڵتونێکی پێوە بوو لە خۆی کردەوە و لە موژدانەدا دایە کەنیزەکە.

پاشان ئوم حەبیبە ناردی بە شوێن هاوەڵی کۆچکردووی خالیدی کوڕی سەعیدی عاسدا، کە بیکاتە وەکیلی خۆی، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ نەجاشی پاشای کردە وەکیل بۆ خۆی.. ئەوەبوو لە کۆشکی پاشایەتی نەجاشیدا شیرینی ئەم هاوسەرگیرییە

پیرۆزە خورایەوە، هەر لەوێدا پاشای حەبەشە (٤٠٠) دیناری ئاڵتونی كردە مارەیی ئوم حەبیبە و خستیە بەردەستی قەومەكەی تا بیدەنە ئوم حەبیبە، پاش ئەو شیرینی خواردنەوەیەش نەیهێشت كەس لە خزمانی و بەشداربوانی ئەو كۆڕە پیرۆزە هەستن و وتی: پێویستە نانی شاییەكەشیان بخۆین، چونكە لە سوننەتی پێغەمبەرانە دروست كردن و نان دانی شایی.

بێگومان ئوم حەبیبە بە مارەبڕی پێغەمبەر ﷺ شەش تا حەوت ساڵ لە حەبەشە ئەمێنێتەوە لەژێر چاودێری مەلیكی حەبەشەدا، پاشان لەگەڵ نوێنەری كۆچكردووەكاندا بە سەرۆكایەتی جەعفەری كوڕی ئەبوتالیب كە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بوو بە چەند بارێك حوشتر دیارییەوە ئەنێردرێتەوە بۆ مەدینە و چاوەكانی بە دیداری پێغەمبەر و موسڵمانان ڕۆشن ئەبێتەوە، كە لەو كاتەدا تەمەنی نزیكەی چل ساڵ دەبێت.

ئایا ئەتوانرێ بەم شێوازی ژنهێنانەی پێغەمبەر ﷺ بوترێ هەوا و هەوەس و ئارەزووبازیی، چ ئارەزووبازییەك هەیە لەم كارەدا؟ ئەمە ئارەزووبازییە، یان گەورەترین هەڵوێستی مەردایەتی و قوربانیدان بوو بەرانبەر بەو ئافرەتە تێكۆشەرانەی كە دەستیان نابوو بە هەموو بەرژەوەندییەكی خۆیانەوە لە پێناو ئاینەكەیاندا، نواندنی سۆز و خۆشەویستی بەرانبەر بەو ئافرەتە بێوەژنانەی كە بێبەش بوو بوون لە هەموو سۆز و داڵدە و دڵنەواییەك كە وەك هەموو ئافرەتێكی تری دەوروبەریان پێویستی ڕۆژانەیان پێ هەبوو..

## ٤ـ ئوم سەلەمە رضي الله عنها :

بەر لەوەی بچینە سەر باسی ژیانی ئەم خاتوونە بەڕێزە، نووسەر هەندێ درۆ و قسەی هەڵبەستراو ئەهێنێت دەربارەی و پێویستە بەكورتی وەڵامی بدەینەوە كە گوایە (ئوم سەلەمە، كە بە ئوم سەلامە ناوی هێناوە، هەرگیز نەدار نەبووە، مێردی یەكەمی خۆشویستووە و ڕازی نەبووە شوو بكاتەوە، هەر بۆیە سێ جار خوازبێنی موحەممەدی دەست پێوەناوە و پێی وتووە: "من ژنێكم بە تایبەتمەندییەكی زۆر بەغیلانەوە، تۆش ئەی پێغەمبەر دەتەوێ چەند ژن بهێنی، ئەمەی وت وەك هۆیەك

بۆ ڕەدکردنەوەی خوازبێنییەکەی"، جارێك ئەمە (ئوم سەلامە) نییە و (ئوم سەلەمە)یە و جارێکی تر ئەوە بەغیلی نییەو بەڵکو غیرەدارییە و جارێکیش ئەوە ڕەتکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ نییە، بەڵکو خۆناساندنی زیاترە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیتر نازانم نووسەر ئەم درۆ و بوختان و نەزانینانەی لە سوچی چ سەرچاوەیەك دەرهێناوە، ئەگەر متمانەی بە خۆی و قسە و سەرچاوەکەی ببوایە ئەبوو ئاماژەی بە ناوی سەرچاوەکە بکردایە، یاهەر چێو لە تاریکی ئەوەشێنن و ئەیانەویت نوری خوا بەدەم بکوژێننەوە (يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) (الصف: ٨) ئەیانەویت نووری خوا بە فوی دەمیان بکوژیننەوە و خوای گەورەش نووری خۆی پڕ پتەوتر ئەکات، هەرچەندە کافران پێشیان ناخۆش بێت. بە بۆچوونی نووسەر هەر ئافرەتێك دەوڵەمەند بوو، ئیتر پێویستی بە شووکردن نییە.. دیارە لەلای ئەو مەبەست لە شووکردن تەنها پەیداکردنی نەفەقە و بژێوییە، نەك ئەو هەموو لایەنە ئیجابیەی تر کە سەراپا سوودمەندبوونی ئەو ئافرەتەیە تێیدا و پاراستی هەموو بەها باڵاکانییەتی. هەر بۆیە بە پێویستی دەزانم بۆ ڕەوینەوەی ئەو پڕوپاگەندە بێ بنەمایانەی نووسەر درێژە بە باسی ژیانی ئەم بەڕێزە بدەم و خوێنەر خۆی هەڵسەنگێنەری باسەکە بێت.

ئوم سەلەمە ناوی هندی کچی ئەبو ئومەیەی کوڕی موغەیرەی مەخزومییە، باوکی یەکێك بوو لە خانەدانەکانی قوڕەیش کە نازناوی (زاد الراکب)ی لێ نرابوو بە هۆی ئەو نان بدەیی و سەخاوەتەی کە هەیبوو، بە تایبەت لە کاتی سەفەرکردندا کە کەس نەبوو لەو سەفەرەدا بێبەش بووبێت لە نان و خواردەمەنی باوکی سەلەمە.

دایکیشی ناوی عائیکە کچی عامری کوڕی ڕەبیعەی کینانی بوو، کە لە خانەوادە شکۆدارەکانی ناو مەککە بوون، لەگەڵ ئەوەی کە لەو بنەماڵە شکۆدارە بوو، خاوەنی جوانی و ڕەوشت بەرزی و زیرەکییەکی بەرچاو بوو.

خێزانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی بوو، هەروەها یەکێك بوو لە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەر و خاوەنی هەردوو کۆچی حەبەشەو مەدینە بوو، ئەم ئافرەتە بەڕێزە بە هەموو شێوەیەك پشتیوانی هاوسەرەکەی بوو لە تێکڕای ئەو زوڵم

و ستەم و دەربەدەرییەی کە تووشی دەبوو لەپێناو بیروباوەڕ و پەیامی خواییدا.. لە حەبەشەدا کوڕێکی بوو ناوی نا (سەلەمە) هەر بەو ناوەوە وەك عورف و عاداتی عەرەبەکان نازناوی وەرگرت بە (ئوم سەلەمە)، ئەوەبوو لە پاش موسڵمان بوونی ئیمامی حەمزە و ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب زۆربەی موسڵمانەکانی حەبەشە گەڕانەوە بۆ مەککە، بەو هیوایەی بتوانن ئازادانە و دوور لە ئەشکەنجە و ئازار پیادەی بیروباوەڕی خۆیان بکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە تا دەهات خەشم و قینی قوڕەیشییەکان زیاتر تینی دەسەند. هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ جارێکی تر فەرمانی کردەوە بە هاوەڵان کە هەرکەسێك لە توانایدا هەیە با کۆچ بکات بۆ مەدینە. ئەم خێزانە بەڕێزەش جارێکی تر خۆیانیان ئامادەکردەوە بۆ ئەم کۆچە، بەڵام لە دەرەوەی مەککە خزمەکانی ئوم سەلەمە ڕێگایان پێگرتن و ئوم سەلەمە و کوڕەکەیان گەڕاندەوە بۆ مەککە و دەستبەرداری ئەبو سەلەمە بوون و ئەویش بە تەنها کۆچی کرد و دایك و کوڕەش لە لایەن هەردوو ماڵە باوانەوە لە یەکتر کران تا ساڵێك، ساڵێکی پڕ لە مەینەتی و ئێش و ئازاری دوور لە یەك بەهەرحاڵ پاش ساڵەکە ئازادیان کردن و ئیزنیان دان کە بڕۆن و کۆچ بکەن بۆ مەدینە. ئەوەبوو ئەم خێزانە ئارامگرە بە یەکتر شادبوونەوە و ژیانێکی خۆشی پڕ سەروەرییان بەسەر ئەبرد، هەر لە ماوەی پێکەوەژیانییاندا خوای گەورە کردنییە خاوەنی دوو منداڵی تر بە ناوی عومەر و زەینەب.

ئەوەبوو بە تێپەڕبوونی کات ڕووبەڕووبوونەوە و پێکدادان لە نێوان موسڵمانەکان و قوڕەیشییەکان ڕوویدا، ئوم سەلەمە و عەبدوڵڵای هاوسەری هەروەك هەموو هاوەڵانی تر بەشدارییان لە غەزاکاندا دەکرد، عەبدوڵڵا لە غەزای ئوحود باڵی بە سەختی بریندار بوو، بە شێوەیەك خستیە جێگاوە، ئەم بەڕێزە لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەدا هاوسەرەکەی لەیاد نەئەکرد و بەردەوام دڵنەوایی ئەکرد و ئەیوت: ئوم سەلەمە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کە ئەفەرموێ: (لا یصیب أحداً من المسلمین مصیبە فسیرجع عنذ مصیبە پم یقول: (اللهم أجرنی فی مصیبتی واخلف لی خیراً منها الا فعل بە).

**واتە: موسڵمانێك نییە تووشی هەر کارەسات و موسیبەتێك ببێت و بگەڕێتەوە بۆ لای خواو بڵێ: (انا لله وانا اليه راجعون) دوای ئەوە بڵێ: خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم کارەساتە و بە باشتر و چاکتر جێگاکەیم بۆ پڕ بکەرەوە، ئیلا خوای گەورە دوعاکەی لێ وەرئەگرێ و کارەکەی بۆ ئەکات!**

**لەو چەند ڕۆژەدا بەیانییەکیان پێغەمبەر ﷺ هاتبووە دیداری و زۆری نەخایاند بوو گیانی پاکی بە خوای میهرەبان سپارد و پێغەمبەریش ﷺ بە دەستەکانی خۆی چاوەکانی عەبدوڵڵای نابەیەکدا و دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی:** (اللهم اغفر لأبي سلمة وارفع درجة في المقربين، واخلفه في عقبة في الغابرين واغفر لنا وله يارب العالمين).

**واتە: ئەی خوایە لە ئەبو سەلەمە خۆش ببە و پلەی بەرز بکەرەوەو بیخەرە ناو کەسانێك کە لە ڕۆژی دواییدا نزیك ئەبنەوە لێت، چاکیش بکەیت بۆ ئەوانەی کە لێی بەجێماون و لە ئێمەش و لە ئەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانیان.**

**هەر لەو کاتەشدا ئوم سەلەمە رضي الله عنها زۆر بە ئارام و دانی بەخۆی دا گرت و تەسلیمی قەزا و قەدەری خوایی بوو، پاشان دەستی کرد بە وتنەوەی ئەو دوعایەی کە ئەبو سەلەمە فێری کردبوو، بەڵام بەشی دووەمی دوعاکە کە ئەفەرموێ: (جێگاکەیم بە باشتر بۆ پڕ بکەرەوە) وەك حاڵەتێکی دەروونی خۆشحاڵ نەبوو بە وتنی، چونکە ئەیووت: ئەبێ کێ باشتر بێت بۆ من لە ئەبو سەلەمە؟**

**ئینجا پاش تەواو بوونی (عدە)کەی ئوم سەلەمە، زۆرێك لە هاوەڵانی هاتنە پێشەوە لێی و خوازبێنییان لێکرد بە هێوای بەتەنها نەمانەوەی و پارێزگاری کردن لە ماڵ و منداڵی ئەو هاوەڵە شەهیدەیان، دیارە ئەم هەڵوێستەش هەڵوێستێکی جوامێرانە بوو کە هەیانبوو بەرانبەر بە خانەوادەکانیان، هەرچەندە ئوم سەلەمە زۆر بە ژیرانە دەستی نا بە ڕووی هەموویانەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە زۆری نەخایاند پێغەمبەر ﷺ کەوتە بیرکردنەوە لەو ئافرەتە ئارامگر و تێکۆشەرە کە چۆن بەو شێوەیە بە تەنهاو بێ داڵدە و دڵنەوایيدەرێك بمێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەش نییە شوو بە هیچ کام لە هاوەڵان بکاتەوە..**

هەر بۆیە خۆی ﷺ ئیقدامی کرد بۆ ئەو کارە و تەشریفی بردە ماڵەکەی و خوازبێنی لێکرد کە ئەگەر پێی باش بێت و ڕازی بێت بە نیازی مارەکردنیەتی..

ئوم سەلەمەش هەڵوێستەیەکی کرد و داواکەی پێغەمبەری ﷺ زۆر بە لاوە سەیر بوو! کە ئایا ئەبێ پێغەمبەری خوا بەڕاستی بێ و داخوازییەکەی بۆ خۆی بێ؟ پاشان کەوتە بیرکردنەوە و خێرا دوعاکەی ئەبو سەلەمەی کەوتەوە یاد (واخلف لی خیراً منها).

ئینجا کەوتە ورد و دڵی خۆی و وتی: بەڕاستی ئەمە ئەو خەیرەیە کە خوای گەورە جێگاکەی ئەبو سەلەمەم بۆ پڕ ئەکاتەوە پێی، دوای ئەوە بەئاگا هاتەوە و وتی: (مرحباً بك یارسول الله) ئەبێ من ڕازیو خۆشحاڵ نەبم بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام بە فیدات بم! ئاگاداری لێم کە من ئافرەتێکی پیر و بە تەمەنم و خاوەنی چەند منداڵی هەتیوویشم، غیرەشم زۆرە ئەترسم کارێك بکەم جەنابت زویر ببی و منیش تووشی سزای خوایی ببم لەسەرت..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەبارەت بە تەمەنەکەت، من لە تۆ بەتەمەن ترم! نەنگی نییە بۆ پیاوێك کە ژنێکی لە خۆی بە تەمەنتر بهێنێ. سەبارەت بە منداڵەکانیش هەموویان لە ئەستۆی خوا و پێغەمبەری خوادان، دەربارەی ئەو غیرەیەش کە هەتە من خۆم نزات بۆ ئەکەم کە خوای گەورە ئەو سیفەتەت تێدا نەهێڵێ..

ئوم سەلەمە کە زانی پێغەمبەر ﷺ بەڕاستییەتی، ڕووی تێکرد و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی خۆی دەربڕی و وتی: بەڕاستی ئەمە ئەو خەیرە بوو کە خوا بە باشتر لە ئەبو سەلەمە بۆی پڕ کردمەوە.. ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ئەو ئافرەتە شکۆدارە بوویە دایکی باوەڕداران و خاوەنی یەکێك لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و پارێزگاری لەو جێگاو شوێنە پیرۆزە بەشێوەیەك دەکرد کە باوەشی خۆشەویستی و سۆزی بۆ هەموو خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ کردبوویەوە و بوو بووە مایەی خۆشحاڵی پێغەمبەر ﷺ. ئوم سەلەمە تا بڵێی ئافرەتێکی زیرەك و تێگەیشتوو بوو بەڕادەیەك لە هەر شوێن و جێگایەکدا هەر ڕەخنە و پێشنیارێکی ببوایە جێگای خۆی دەگرت. بۆ نموونە: ڕووداوەکەی ڕۆژی ئاشتینامەکەی حودەیبیە کە پێغەمبەر ﷺ

لەو ڕۆژەدا لەگەڵ نوێنەرانی قوڕەیشدا ڕێکەوت و ئاشتینامەکەی مۆرکرد کە یەکێك لە بەندەکانی ئەو ئاشتینامەیە نەکردنی عومرەکەیان بوو، هەر بۆیە موسڵمانەکان زۆر نیگەران و بێ هیوا بوون و ئەم کارەیان بە لەدەستدانی مافی خۆیان دەزانی، زۆر بە لایانەوە سەخت بوو بگەڕێنەوە و عومرەکەیان نەکەن.. لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ فەرمان ئەکات پێیان کە قوربانییەکانیان سەرببڕن و سەریان بتاشن، بەڵام موسڵمانەکان بە هۆی زۆری نیگەرانیانەوە ناچن بەدەم فەرمانەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ، هەر بۆیە زۆر غەمبار ئەبێ و بە ڕوویەکی گرژ و خەفەتبارانەوە ڕوو ئەکاتە خێمەکەی ئوم سەلەمە و بارودۆخەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە کە گوایە موسڵمانان لە فەرمانی دەرچوون و ئەترسێ کە بە هیلاکا بچن.

ئوم سەلەمە فەرمووی: ئەگەر پێت خۆشە بە دەم فەرمانەکەوە بێن، بڕۆ دەرەوە و قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا مەکە تا قوربانییەکەی خۆت سەر ئەبڕی و سەرتاشەکە بانگ ئەکەیت سەرت بتاشێت..

پێغەمبەر ﷺ بێ دوودڵی و بیرکردنەوە خێرا بۆچوونەکەی ئوم سەلەمەی وەرگرت و چوویە دەرەوە و قوربانییەکەی خۆی سەربڕی و سەرتاشەکەی خۆی بانگ کرد و سەری خۆی تاشی.

کاتێك کە موسڵمانەکان ئەو شێوازەیان بە پێغەمبەرەوە بینی هەر هەموویان بە پەلە و بێ دواکەوتن قوربانییەکانیان سەربڕی و یەك بۆ یەك سەری یەکتریان ئەتاشی بە شێوەیەك کە خەریك بوو یەکتریان بریندار ئەکرد.[١٩]

پاش لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئافرەتە لێهاتووە بە هەمیشەیی چاودێری کاری موسڵمانانی ئەکرد، بەتایبەت کەسانی بەرپرس و فەرمانڕەوا و ڕووداوەکانی ڕۆژگار لە پێناو یەکێتییەك هەڵوێستی ئومەتی ئیسلامی تا کۆتایی بە تەمەنی پیرۆز و پڕ بەرەکەتی هات لە مانگی ذی القعدەی ساڵی ٥٩ی کۆچی کە تەمەنی لە (٨٤) ساڵ تێپەڕی کردبوو..

[19] رواه البخاري في الشروط، باب شروط في الجهاد والمصالحة مع أهل الحرب والسيرة النبوية الصلابي (٢/ ٤٦٢)

ئەمە كورتەیەك بوو لە ژیانی ئەم دایكە بەڕێزە و لە هەر سەرچاوەیەكدا بۆی بگەڕێیت جگە لە چاكە هیچی ترت دەست ناكەوێت، ئیتر نازانم ئەم نووسەرە لە كام سەرچاوە ئەو هەمووە درۆ و دەلەسەیەی گواستۆتەوە؟ لەوانەیە سەرچاوەكانی ئەم كەسانێكی وەك خۆی بێ ئەزموون و نەشارەزا بن لە مێژوونووسین، یان ئەم بێویژدانی كردبێت و مەبەستی چەواشەكردنی خوێنەران بووبێت.

## دووەم: بەهێزكردن و پتەوكردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوەڵاندا (توثيق روابط الصحبة):

ئامانجێكی گەورەی تری پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە پتەوكردنی پەیوەندی و گومان لەوەدا نییە كە هەمیشە پێغەمبەر ﷺ هەوڵی نزیك بوونەوەی داوە لە هاوەڵان، هەردەم لە خولیای دروستكردنی پەیوەندییەكی ڕۆحی و دەروونی بووە لەگەڵیاندا بە شێوەیەك كە ئەوانیش گیان وماڵیان لەپێناو دادەنا.

دروستكردنی ئەو پەیوەندییەش هەر جارەی بە شێوازێك، یەكێك لەو شێوازانە ژن و ژنخوازی بووە، ئەوەتە هەر لەو ڕێگایەوە گەورەترین پەیوەندی لەگەڵ هەر چوار كەڵە پیاوەكانی ئەم ئیسلامەدا دروست كردبوو كە هەر چواریان وەك سەر وابوون بۆ لاشە.. كە سێ دانە لە كچەكانی ئەداتە هەردوو خەلیفە عوسمانی كوڕی عەففان و عەلی كوڕی ئەبوتالیب، هەردوو كچی خەلیفە ئەبوبەكر و عومەری كوڕی خەتاب لە خۆی مارە دەكات و دڵی هەر چوار خەلیفەكە وەك یەك ڕاگیر دەكات و پەیوەستیان ئەكات بە خۆیەوە.. كە لەمەودوا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی كورتەیەك لە ژیان و بەسەرهاتی دووان لە خێزانەكانی تری پێغەمبەر ﷺ كە هۆكاری بەهێزكردنی ئەو پەیوەندییە بوو لە نێوان پێغەمبەر و هاوەڵانیدا..

### ١ـ عائیشەی كچی ئەبوبەكری صدیق رضي الله عنها:

عائیشە كچی ئەبوبەكر، عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی قوحافە عوسمانی كوڕی عامری قوڕەیشی بوو، كە یەكێك بوو لە بنەماڵە ناودارە شایستەكانی مەككە، دایكیشی ناوی ئوم ڕوومان بوو.

**خواستنی عائیشه له لایه‌ن پێغه‌مبه‌ری خواوه ﷺ هه‌روا شتێکی ساده و حه‌ز و ئاره‌زوو نه‌بوو، به‌ڵكو كارێك بوو له لایه‌ن خواوه به ڕێگای خه‌وبینین نیشانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ درابوو، هه‌روه‌ك له زاری دایكمان عائیشه‌وه ئه‌گێڕنه‌وه كه ئه‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ سێ شه‌و له‌سه‌ر یه‌ك دوای كۆچی دوایی خاتوو خه‌دیجه رضي الله عنها خه‌وی بینیوه كه فریشته‌یه‌ك هاتووه و عائیشه‌ی له تارایه‌كی ئاوریشمیندا پیشانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ دراوه و پێی فه‌رمووه ئه‌مه خێزانته.. كاتێك كه سه‌ریم هه‌ڵداوه‌ته‌وه تۆم بینیوه له ناویدا.**[٢٠]

**دیاره به حوكمی تێكه‌ڵی پێغه‌مبه‌ر و هاوه‌ڵان به‌تایبه‌ت هاوه‌ڵی زۆر خۆشه‌ویستی ئه‌بوبه‌كری صدیق رضي الله عنه خێزان و منداڵه‌كانیشیانی ناسیونه‌ته‌وه، هه‌ر ئه‌و تێكه‌ڵییه‌ش بوو كه له خه‌ودا عائیشه‌ی ناسییه‌وه، به‌ڵگه‌نه‌ویستیشه كه خه‌وی پێغه‌مبه‌ران (وحی) نیگایه و پێویسته به‌جێی بهێنن.. كاتێك كه خه‌وله‌ی كچی حه‌كیم پێشنیاری ژنهێنان ئه‌خاته به‌رده‌م پێغه‌مبه‌ر ﷺ دوو ئافره‌تی له خه‌یاڵی خۆیدا ده‌ستنیشان كردبوو به‌و هیوایه‌ی یه‌كێكیان هه‌ڵبژێرێ، ئه‌ڵێت: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌توانم داخوازی یه‌كێك له‌م دوو ئافره‌ته‌ت بۆ بكه‌م كه یه‌كێكیان بێوه‌ژنه و ئه‌وی دیكه‌شیان كچه. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: بڵێ بزانم كێن ئه‌و دوو ئافره‌ته؟ خه‌وله وتی: بێوه‌ژنه‌كه‌یان سه‌وده‌ی كچی زه‌معه‌یه و (له پێشه‌وه باسمان كرد) كچه‌كه‌ش كچی خۆشه‌ویسترین هاوه‌ڵته كه عائیشه‌ی كچه ئه‌بوبه‌كره، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: بڕۆ داخوازی هه‌ردووكیانم بۆ بكه، ئه‌وه‌بوو له ژیانی سه‌وده‌ی كچی زه‌معه ئاگادار بووین، به‌ڵام بۆ عائیشه هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ست بخاته سه‌ری داخوازی كرد هه‌رچه‌نده ئه‌ڵێن ته‌مه‌ن شه‌ش ساڵان بووه، به‌ڵام پاش كۆچكردن بۆ مه‌دینه و دوای غه‌زای به‌در كه ته‌مه‌نی له (٩) ساڵان تێپه‌ڕ ده‌كات و ده‌یگوێزنه‌وه.. دیاره به‌پێی گه‌ڕان به دوای ته‌مه‌ن و كچان و شووكردنیان له دورگه‌ی عه‌ره‌بیدا، ئه‌و ته‌مه‌نه ته‌مه‌نێكی ئاسایی**

---

[20] رواه المسلم والبخاري في صحيحيها عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله ﷺ ارتيك في المنام ثلاث ليال جاء بك الملك في خرقة من حرير فيقول: هذه امرأتك فاكشف عن وجهك فاذا أنت فيه، فاقول: (ان بك هذا من عندالله يمضيه).

بووە بۆ شوو کردن، چونکە کچان لە ناوچەی گەرمەسێردا زووتر پێ دەگەن و ئامادەیی شوکردنیان دەبێت تا ناوچە ساردەکان، گوێزانەوەی عائیشە لەو تەمەنەدا نەبووەتە هاوسەر و سەرسوڕمانی خەڵکی، بەڵکو کارێکی عادەتی و ئاسایی بووە لای خەڵك و دەوروبەری، بێگومان دایکمان عائیشە ﵂ لە دوای خاتوو خەدیجە خۆشەویسترین کەس بووە بە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ هەروەکو عەمری کوڕی عاس ﵁ ئەڵێ: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ کە کێ خۆشەویسترین کەسە بە لاتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عائیشە! وتم: ئەی لەناو پیاواندا؟ فەرمووی: باوکی.[21]

لە هەموو خێزانەکانی تری زیاتر لاواندویەتی و خۆشەویستی زیاتری بۆ دەربڕیوە و چاودێری کردووە بەو هیوایەی پێی بگەیەنێت لە هەموو لایەنەکانی فەرموودە و فیقه و سەرجەم زانستەکانی تر.

لە ڕاستیدا بەهۆی منداڵی و زۆر پەیوەست بوونی بە پێغەمبەرەوە ﷺ گرنگیدانی بە هەڵسوکەوتییەوە، بوو بە مامۆستایەك کە سەرجەم ژنان و پیاوان سوودمەند بوو بوون لێی، زوهری بۆمان دەگێڕێتەوە ئەڵێ: ئەگەر زانست و زانیاری عائیشە کۆ بکەیتەوە و بەراوردی بکەیت لەگەڵ زانستی هەموو ئافرەتاندا ئەوا زانست و زانیاری عائیشە چاکترە.[22]

هیشامی کوڕی عوروە ئەگێڕێتەوە لە باوکی کە وتویەتی: هاوەڵیی عائیشەم کردووە! کەسم نەبینیوە لەو شارەزاتر بێت سەبارەت بە دابەزینی ئایەتەکانی قورئان و فەرمانەکانی خوا لەسەر بەندەکانی و شەریعەت و شیعر و هۆنراوە و ڕوونکردنەوەی هەموو بابەت و لایەنەکان، شارەزایی دەربارەی ڕۆژەکانی عەرەب و ڕەچەڵەك و بڕیار و زانیاری پزیشکی، منیش وتم: پورێ گیان زانیاری پزیشکی لە کێوە فێربوویت، ئەویش وتی: کاتێ کە نەخۆش ئەکەوتم شتێکیان بۆ ئەنواندنم، نەخۆشێك کە

---

[21] (مسلم) برقم ٨/ ٢٣٨٤

[22] الطبراني في الكبير (٢٣/ ١٨٤).

**شتێكیان بۆ ئەنواند گوێم ئەگرت لە خەڵكیی كە شتیان بۆ یەكتر ئەنواند منیش هەڵم ئەگرت و لەبەرم ئەكرد.[٢٣]**

**هەروەها (٢٢١٠) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە و مەرجەعێك بووە بۆ هاوەڵان لە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ.**

**عەتای كوڕی ئەبی ڕەباح دەربارەی ئەڵێت: (عائیشە زاناترین كەسە، شارەزاترین كەس و باشترین كەس بووە لە دەربڕینی بیروبۆچوونی دەربارەی خەڵكی بە گشتی)،[٢٤] هەر بۆیە ئیمامی زەركەشی ئەڵێت: چواریەكی حوكمە شەرعییەكان لە عائیشەوە وەرگیراوە[25]، كەواتە عائیشە تەنها زانا نەبووە، بەڵكو زاناترین كەس بووە كە فەتوای داوە لە خیلافەتی ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان رضي الله عنه و قازییەكان لەلای كۆ ئەبوونەوە بۆ چارەسەری هەندێ لە كێشەكان و ئەویش لەپشتی پەردەوە لەگەڵیان دائەنیشت و وەڵامی پرسیارەكانیانی ئەدایەوە[26]..**

**هەروەها ئەحنەفی كوڕی قەیس دەربارەی ئەفەرموێ: گوێم لە خوتبەی ئەبوبەكر و عومەری كوڕی خەتاب و عوسمانی كوڕی عەففان و عەلی كوڕی ئەبی تالب گرتووە، گوێم لە قسە و بەلاغەتێك نەبووە لە هیچ مەخلوقێكی جیهان لە وتە و قسەی خاتوو عائیشە پڕتر بێت لە زانیاری.**

**لەگەڵ ئەو هەموو شارەزاییەشدا كۆمەڵێك سیفاتی جوانی تری هەبووە كە مایەی شانازی هەموو ئافرەتێكی موسوڵمانە وەك: ئازایەتی و ڕەوانبێژی و بەخشندەیی و دڵفراوانی بەشێوەیەك تا هەژار و بێ نەواكان بووبن خۆی لەبیر نەبووە بۆ نموونە:**

---

[23] قال هشام بن عروة عن أبية قال: لقد صحبت عائشه، فما رأيت أحداً قط كان أعلم بآية أنزلت ولا بفريضة ولا سنة، ولا بشعر، ولا أروى له، ولا بيوم من أيام عرب، ولا بنسب، ولا كذا، ولا بقضاء، ولا طب، منها فقلت لها يا خالة: الطب من أين علمته، فقالت: كنت أمرض فينعت لى الشئ، ويمرض المريض فينعت له، وأسمع الناس نيعت بعضهم لبعض فاخفظه) حلية الاولياء (٢/ ٤٩) ورحالة ثقات.

[24] قال عنها عطاء بن أبي رباح: كانت عائشه أفقه الناس وأعلم الناس وأحسن الناس رأياً في العامة) ابن كثير، وابن حجر.

[25] تعدد الزوجات في الإسلام — عبدالله ناصيح علوان — ص٩٠.

[26] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ( ٩١)

جارێکیان خەلیفەی موسڵمانان سەد و هەشتا هەزار درهەمی بۆ دەنێرێ تا بیکاتە خەرجی خۆی، (دیارە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ خەرجی خێزانەکانی لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانان دەبێت). لەو ڕۆژەشدا بەڕۆژوو دەبێت، کەنیزەکەکەی بانگ دەکات و هەموو پارەکان بەش بەش دەکا و دابەشی دەکات بەسەر هەژاراندا، پاشان کەنیزەکەکە ئەڵێت پێموت: ئەی دایکی باوەڕداران با چەند درهەمێکت بهێڵایەتەوە بۆ کڕینی هەندێ گۆشت و ئێوارە ڕۆژووەکەت پێ بشکاندایە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر لەیادم بوایە وامدەکرد، ڕۆژووەکەی هەروەك ڕۆژانی تر بە نان و زەیت شکاند و بەربانگی کردەوە[٢٧].

ئەمە کاری ئەم خاتوونە دونیانەویستە بوو، نەك پڕوپاگەندە و قسەی بێ جێی دوژمنانی دین بەوەی کە گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری ﷺ کردبێتە مایەی پەیداکردنی پارە و سامان، ئەم خووە ناشیرینە زۆر دوورە لە کۆمەڵگای موسڵمانان نەك خێزان و خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ کە دەستیان نا بە هەموو خۆشییەکانی دونیا لە پێناو ڕەزامەندی پێغەمبەر و پاداشتی ڕۆژی دوایی، بەڕاستی نازانم ئەمە چ بێشەرمییەکە کە بەخەرجی دەدەن بەرانبەر بە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ کە چواردە سەدە زیاتر جیهان نموونەی ئافرەتی وەك خاتوو عائیشەی بەخۆیەوە نەدیوە رضي الله عنها، دوریش نییە ئەم هێرشکردنە سەر عائیشە لە ئەدەبیاتی شیعەوە وەری گرتبێت کە نووسەر ماوەیەکی زۆر لە ئێراندا ماوەتەوە پیرۆزی و بەرەکەتی خاتوو عائیشە بە شێوەیەك بووە کە مایەی ئاسانکاری و خۆشبەختی بووە بۆ موسڵمانان، نموونەشیان: دابەزینی ئایەتەکانی تەیەموم بۆ نوێژ هۆکارەکەی خاتوو عائیشە بووە، کە ئیمامی موسلیم گێڕاوێتییەوە کە: عائیشە ملوانکەیەکی لە ئەسمای خوشکی وەرگرت، پاشان ونی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی نارد بە هیوای دۆزینەوەی، ئەوەبوو کاتی نوێژەکەیان هاتبوو، بەبێ دەستنوێژ نوێژەکەیان کردبوو، چونکە ئەو شوێنەی ئەوانی لێ بوو بوون ئاوی تێدا نەبوو بوو، کاتێ کە گەڕاونەتەوە لای پێغەمبەر و ئەو هەواڵەیان پێ گەیاندووە، هەر لەو ساتەدا ئایەتەکانی تەیەموم دائەبەزێت، هەر بۆیە

[27] صحابيات حول الرسول ﷺ، محمد الراجي حسن كناس، ص٢١٠.

**ئوسەیدی كوڕی حوزەیر وتی: خوا پاداشتی چاكەت بداتەوە، سوێند بە خوا هەر كارەسات و كارێكت بۆ پێش هاتبێت خوای گەورە دەرووی خێری لێ كردوویتەوە و بووەتە هۆی پیرۆزی و بەرەكەت و ئاسانكاری بۆ موسڵمانان.[28]**

**ئەم خانمە ناوازەیە ئەكەوێتە ناو گەورەترین و ناهەموارترین تاقیكردنەوە و تاقیكردنەوەیەك كە ڕووی لە كەسایەتی و شەرەفی پێغەمبەر و ﷺ عائیشە و هەردوو بنەماڵەی بەڕێزیان و سەرجەم موسڵمانان دەكات كە ناسراوە بە (حادثة الإفك) ڕووداوی بوختان كردن، ئەم بوختانە بەدەم ئافرەتێكەوە كرا كە خوای گەورە لەسەری هاتە وەڵام و لە پشت هەموو ئاسمانەكانەوە پاكی و نەزاهەتی دابەزاند و كردوویە چەند ئایەتێكی قورئانی پیرۆز و تا ڕۆژی دوایی پەرستشی خوای پێوە دەكرێ و دەخوێنرێتەوە، بوو بە یاسایەك بۆ بڕواداران كە ڕاوبۆچوون و هەڵسوكەوتیان لەگەڵ یەكتردا چۆن بێ بە چ شێوازێك كۆمەڵگاكەیان بەپاك ڕابگرن لە شتانێك كە مایەی شپرزی و داڕوخانیانە، هەروەها هۆشیاركردنەوەی كۆمەڵگایە دەربارەی چین و توێژی ئافرەتان و پاراستنیان لە قسەگەلێك كە مایەی سوكایەتی و ئابڕووبردنیانە، تەنانەت پاراستنیان لە كوشتن بە ناوی (غسل عار) كە ڕێژەیەكی زۆری ئافرەتان بوونەتە قوربانی ئەو وشەیە، هەر بۆیە خوای گەورە بە كردەوەیی (عملي) پاكترین خانەوادە ئەخاتە ئەو میحنەتە گەورەیە تا سەرهەڵدان و ئەنجامەكەی بكاتە دەستوور و یاسا بۆ تەواوی موسڵمانان تا بە چاوڕۆشنی مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریاندا بكەن، چونكە ئیسلام هاتووە بۆ ڕزگاركردنی خەڵكی لە ترس و تۆقاندن و سوكایەتی پێكردن، ڕزگار كردنیان لە كۆیلایەتی ستەمكاران، كوشتنی كەسێكی بێتاوان لای خوای گەورە زۆر قوسترە لە نەمان و تێكدانی شیرازەی بوونەوەر، چونكە مەبەستەكانی شەریعەت و بەها باڵاكان (مقاصد الشريعة) لە ئایینی**

[28] أخرج الامام مسلم من حديث هشام، عن ابيه عن عائشة: انها استعارت من اسماء قلادة، فهلكت، فارسل رسول الله ﷺ ناساً من أصحابيه في طلبها، فادركتهم الصلاة، فصلوا بغير وضوء، فلما أتوا النبي ﷺ شكوا ذلك اليه، فنزلت آية التيمم، فقال أسيد بن حضير: جزاك الله خيراً، فوالله: مانزل بك أمر قط الا جعل الله لك منه مخرجاً، وجعل للمسلمين فيه بركة .

پیرۆزی ئیسلامدا پێنج شتە کە ئەمانەن: (پاراستنی دین و ژیری و نەفس و وەچە و ماڵ)ە. لەبەر ئەوە نامانەوێ زیاتر درێژە بە باسەکە بدەین، دەچینە ناو کورتەی رووداوی بوختانەکەی خاتوو عائیشە ﵂ کە دوژمنانی دین و مرۆڤایەتی تووتی ئاسا کۆمەڵێك قسەی بێ بنەما و دوور لە راستییان لەبەر کردووە و شورەییش نییە بە لایانەوە هەر جارەی بە بەڵگەیەکی مەلوس دەمکوتیان دەکرێ و درۆکانیان دەدرێتەوە بەنێو چاوانیاندا، سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە درێژەی ئەم باسە لە فەرموودە (صەحیح)ەکاندا هاتووە ئەمەش دەقی ڕووداوەکەیە:

بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە زوهرییەوە کە دایکمان عائیشە ﵂، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك نیازی سەفەرێکی بکردایە، بۆ خێزانەکانی قورعەکێشی دەکرد و هەر کامێکمان ناومان دەرچوایە لەگەڵ خۆی دەیبردین.

عائیشە دەڵێت: لە یەکێك لە شەڕەکاندا ناوی من دەرچوو، منیش لە خزمەتیدا ڕۆیشتم، ئەمەش کاتێك بوو کە بەر لە چوونمان بۆ ئەو غەزایە ئایەتی (حجاب) دابەزیبوو، بۆیە لەنێو کەژاوەدا هەڵدەگیرام، ئەوەبوو ڕۆیشتین تا پێغەمبەر ﷺ بە سەرکەوتوویی کۆتایی بە غەزاکە هێنا و گەڕاینەوە، کاتێك نزیکی مەدینە بووینەوە کۆچ و بارمان خست بۆ حەوانەوە، پاشان شەوێك فەرمانی کرد بە خۆپێچانەوە و ڕۆیشتین، منیش لەو کاتەدا هەستام و لە سوپاکە دوورکەوتمەوە بۆ دەست بەئاو گەیاندن، کاتێك کە کارەکەم ئەنجامدا و گەڕامەوە بینیم ملوانکەکەم پچڕاوەتەوە و نەماوە، هەر بۆیە گەڕامەوە بەنیازی دۆزینەوەی، ئەوەبوو کەس لە سوپاکە ئاگادار نەبوو لێم و کە گەڕابووشنەوە کەژاوەکەی منیان هەڵگرتبوو خستبوویانە سەر حوشترەکەم بەبێ ئەوەی بزانن کە منی تێدا نییە، بە هۆی ئەو لاوازی و کەم گۆشتییەی کە هەمبوو، کاتێك کە ملوانکەکەم دۆزییەوە، گەڕامەوە بینیم سوپاکە هەوارگەیان چۆڵ کردووە، منیش لە شوێنەکەی خۆم دانیشتم، چونکە بێگومان بووم لەوەی کە زانییان کەژاوەکە منی تێدا نییە دێنەوە بە شوێنمدا، ئەوەبوو هەر لەو شوێنەدا خەو زۆری بۆ هێنام و چاوەکانم نابەیەکدا و خەوتم، سەفوانی کوڕی مەعتەلی سەلەمی پاش سوپاکە کەوتبوو دەگەڕا تا گەیشتە ئەو شوێنەی منی لێ بوو،

تارمایی کەسێکی خەوتووی بەرچاو کەوتبوو، نزیك بوو بوویەوە و منی ناسیبوو، چونکە بەرلەوەی حیجاب فەرز بکرێت بە سەرماندا، منی بینیبوو لە دەنگی (انا لله وانا الیه راجعون)ی ئەو خەبەرم بوویەوە[29] و دەم و چاوم داپۆشی سوێند بەخوا ئیتر تەنها وشەیەکی ترم لێ نەبیست، پاشان چۆکی بە حوشترەکەی دا، منیش سواری حوشترەکە بووم و جڵەوی حوشترەکەی کێش دەکرد، تا گەیشتینەوە سوپاکە، کە لەبەر زۆری گەرما باریان خستبوو بۆ پشوودان، بە هۆی منەوە چەندەها کەس بە هیلاکا چوون، سەرگەورەکەیان عەبدوڵڵای کوڕی سەلول بوو، گەیشتینەوە مەدینە، مانگێك نەخۆش بووم، هەموو خەڵکیش ئەم باسەیان بیستووە من نەبێت، هەستم بە هیچ نەدەکرد ئەوە نەبێ کە نەخۆش دەبووم پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سۆزی بۆ دەردەبڕیم، بەڵام ئەم جارەیان تەنها سەلامی دەکرد و دەیفەرموو حاڵتان چۆنە؟ منیش کەمێك دوودڵ دەبووم بێ ئەوەی لە هۆکارەکەی ئاگاداربم، هەرگیز هەستم بەو بەڵایە نەدەکرد کە شوێنی منیان خستبوو، تا کاتێك خەریکبوو چاك ببمەوە، شەوێك لەگەڵ دایکی مەستەح[30] چووینە دەرەوە، بۆ ئەوەی دەست بەئاو بگەیەنین، چونکە ئێمە واتە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پاش دابەزینی ئایەتی حیجاب شەو بۆ شەو دەچوینە دەرەوە بێزمان نەدەهات توالیت لە ماڵەکانمان دروست بکەین و لەسەر خووی عەرەبە سەرەتاییەکان مابووینەوە[31]، پاش ئەوەی دەستمان بەئاو گەیاند، گەڕاینەوە لەو کاتەدا دایکی مەستەح پێی لە لەشینەکەی گیرا و هەڵکەوت و وتی: داماو بێ مەستەح، منیش وتم: قسەیەکی خراپت کرد، جنێو دەدەیتە یەکێك کە لە غەزای بەدردا بەشداری کردووە؟ ئەویش وتی: ئای چەند بێ ئاگایت، بۆ نازانی چی

---

[29] هۆی دواکەوتنی سەفوان، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردبوو بمێنێتەوە، تا دونیا ڕووناك دەبێتەوە و بگەڕێت هەرچی لە سوپاکە جێمابوو وەك (دڵۆچە و قاپ و قاچاخ و... هتد. کۆی بکاتەوە و پاشان بیانداتەوە دەست خاوەنەکانیان.

[30] مەستەح کوڕی پوری ئەبوبەکری صدیق بوو، بەشداری کۆچ و غەزاکانی کردبوو، کە لە فەرموودەکەدا باسی غەزای بەدری کردووە، بەڵام خانەوادەیەکی هەژار و نەدار بوون، لە لایەن ئەبوبەکر کە باوکی خاتوو عائیشە بوو بژێوی ڕۆژانەیان بۆ دابین ئەکرا.

[31] تەفسیری سێ سورەت —ئامینە صدیق عبدلعزیز- لاپەڕە (٤١)

دەڵێن؟ وتم: دەڵێن چی؟ ئیتر هەواڵی بوختانەکەی بۆ گێڕامەوە و منیش ئەوەندەی تر باری لەشم گران بوو، کاتێك گەڕامەوە ماڵەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەکەم و فەرمووی ئێستا چۆنی؟ وتم: ئیزنم دەدەی بچمەوە لای دایك و باوکم؟ فەرمووی: بڕۆ، چووم بۆ لایان و بە دایکمم وت: دایەگیان خەڵکیی دەربارەی من چی دەڵێن؟ وتی: کچی خۆم بە خوا کەم ئافرەت هەیە خۆشەویست بێت لای پیاوەکەی و هەوێی هەبێت قسەی بۆ دروست نەکرابێت.[٣٢]

عائیشە ئەڵێ وتم: سبحان الله، کەواتە خەڵکیی باسی ئەو بوختانەیان کردووە؟ ئەوەبوو ئەو شەوە تا بەیانی گریام و فرمێسك لە چاوانم وشك نەبوویەوە و چاویشم نەچوویە خەو، بەیانیش هەر دەگریام، ماوەیەکی زۆر (وحی) نیگا نەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ، هەر بۆیە عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد، تا ڕایان وەرگرێ دەربارەی جیابوونەوەی لە خێزانەکەی، عائیشە دەڵێت: ئوسامە ئەوەی دەزانی دەربارەی پاکی خێزانەکەی و خۆشەویستی پێغەمبەریش بۆی ڕای خۆی دەرخست، کە ئەی پێغەمبەری خوا، خێزانی خۆتەو منیش جگە لە چاکە هیچ دەربارەی نازانم، بەڵام عەلی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگای خوا فراوانە و لەوێش ئافرەت زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەکەی بکەیت ڕاستت پێ دەڵێ.

ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: ئەم قسەیە ئامۆژگارییەك بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەندە دوودڵ و گوماناوی نەبێت لە خێزانەکەی و ئارامی لێ هەڵبگرێت. فەرمووی: کەنیزەکەکەی بانگ بکە و ڕاستی و پاکی عائیشەت پێ دەڵێ، ئیتر پێویست ناکات بەو داخەوە بتلێیتەوە و خەڵکیش زیاتر دەم لەم مەسەلەیە بکوتێت، خێرا پێغەمبەر ﷺ بۆچوونەکەی وەرگرت و (بەریرە)ی کەنیزەکی بانگ کرد، ئەویش وتی: بەو کەسەی

[32] ئەم وەڵامەی دایکی گومانێك بوو لە خێزانەکانی تری پێغەمبەر و کەس و کاریان، بە حوکمی ئەو خۆشەویستییەی پێغەمبەرﷺ بۆی و دڵدانەوەی وەك دایکێك، بێ ئاگا بوو لەوەی کە دووڕووەکان هەمیشە لە کەمیندان بۆ ناشیرینکردنی ڕووی گەشی ئەم ئیسلامە، کارەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە دایکی عائیشە گومانی بۆی دەچوو، کە لەگەڵ ئەوەشدا خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر وەك مرۆڤێك خیلافێکی بچوك لە نێوانیان ڕووی دابێت گەیبووەتە ئەو حاڵەتە کە پێغەمبەر دەستەوسان بێت لە ئاست چارەکردنیدا.

گیانی منی بەدەستە و تۆی بەهەق ناردووە، هیچ عەیبێکی نییە، ئەوە نەبێت کە منداڵە و هەندێ جار بەسەر هەویرەوە خەوی لێ دەکەوێ و گیانلەبەر دەم ئەخاتە ناو هەویرەکەوە، هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەر پاکێتی و بەرائەتی عائیشەی بۆ دەرکەوت و چووە سەر مینبەرەکەی و فەرمووی: ئێوە لە جیاتی من چی دەڵێن دەربارەی کەسێك کە خراپەی گەیشتۆتە ڕادەیەك بەرانبەر خاو و خێزانم قسە دەکات؟ کە سوێند بە خوا جگە لە چاکە هیچم لێ نەدیوون و باسی پیاوێکیشیان کردووە خراپەم لێ نەدیوە و نەچۆتە ماڵی من لەگەڵ خۆم نەبێت، کەواتە لێرەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە هەردوو ئامۆژگارییەکەی ئوسامە و عەلی ئیجابی بوون و لە بەرژەوەندی عائیشە بوو (رەزای خوایان لێبێت). پێغەمبەریش لەو دوودڵی و گومانە کەوت و زیاتر دڵی دامەزرا لەسەر پاکی و بەرائەتی خێزانەکەی. عائیشە ئەڵێ: ئەو ڕۆژەش کە پێغەمبەر چووە سەر مینبەرەکە کە هەر گریان بەشم بوو، خەو لە چاوانم تۆرابوو، دایکم و باوکم واهەستیان دەکرد، گریان جەرگم دەبڕێت، هەردووکیان لای من دانیشتبوون ژنێکی ئەنساری هات و ئەویش لەگەڵمدا دەستی کرد بە گریان، پاشان پێغەمبەری خوا هات بۆ لامان و سەلامی کرد و دانیشت، مانگێکیش بوو چاوەڕێی نیگای خوا بوو، بەڵام هیچ نیگایەکی بۆ نەهاتبوو دەربارەی من، کاتێك دانیشت وشەی شایەتی فەرموو ئینجا وتی: ئەی عائیشە دەربارەی تۆ شتێکی ئاوام بیستووە، ئەگەر پاك بیت خوا پاکیت دەردەخات، ئەگەر تاوانێکیشت کردووە داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای، هەر بەندەیەك ئەگەر دان بە تاوانەکەی خۆیدا بنێت و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، خوا لێی خۆش دەبێت. کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە قسەکانی بوویەوە، فرمێسك لە چاومدا وشك بوویەوە و بە باوکم وت: لە جیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا بدەرەوە! وتی: بە خوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا بڵێم.

پاشان بە دایکی وت: دەی تۆ وەڵامی بدەرەوە، دایکیشم وتی: بە خوا نازانم منیش چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆشم لەبەر کەمی تەمەنم زۆرم لە قورئان لەبەر نەبوو، بۆیە وتم: بە خوا دەزانم شتێکتان بیستووە و لە دڵیشتاندا جێگیر بووە، ئەگەر بڵێم من تاوانی بەو جۆرەم نەکردووە، خواش ئاگادارە من زۆر دوورم لەو تاوانە، ئێوە

باوەڕم پێ ناکەن، ئەگەر بڵێم کردوومە، خوا دەزانێ شتی وەها ڕووی نەداوە، باوەڕ دەکەن بە خوا ئەمەی بەسەر مندا هاتووە بەسەر کەسی تردا نەهاتووە، باوکی یوسف نەبێت کە وتی: "فصبر جميل والله المستعان على ماتصفون". ئەمەم وت و پشتم هەڵکرد و لەسەر جێگاکەم پاڵکەوتم، بەخوا دەمزانی خوای گەورە پاکیم لەو تاوانە ڕوون دەکاتەوە، بەڵام هیچ کات گومانی ئەوەم نەدەکرد (وحی) قورئان دەربارەم دابەزێت و بخوێنرێتەوە، خۆمم زۆر لەوە کەمتر دەزانی خوا دەربارەی من بە قورئان فەرموودەی پیرۆزی خۆی نازڵ بکات، بەڵام تکای ئەوەم هەبوو پێغەمبەر ﷺ لە خەودا ببینێت کە من دوورم لەو تاوانە، بەڵام سوێند بەخوا پێغەمبەر ﷺ لە شوێنی خۆیدا بوو، کەسیش لەوانەی لای بوون لە ماڵ دەرنەچووبوون، خوا نیگای ناردو پێغەمبەریش ﷺ وەك جاران بە دابەزینی نیگا ڕەنگی گۆڕاو وەك دەنکە مرواری ئارەقی داڕشت، کە تەنانەت لە ڕۆژی زۆر ساردیشدا لەبەر گرانی نیگا کە وای بەسەر دەهات، کاتێك کە لێ بوویەوە پێ دەکەنی یەکەم قسەیەك پاش نیگاکە فەرمووی ئەوەبوو وتی: عائیشە موژدەبێت خوای گەورە پاکی تۆی دەرخست.

دایکم وتی: هەستە بچۆ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتم: بەخوا ناچم و سوپاسی کەس ناکەم خوا نەبێت.. تەنها خوا بەهانامەوە هات: جا ئەم ئایەتە دابەزی: (إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ * لَوْلَا جَاؤُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاء فَأُوْلَئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ * وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ * إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ * وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ * يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَداً إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ * وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ * إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ * وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ) (النور: ١١ـ ٢٠).

ئەمە ڕاستی ئەو بوختانە بوو کە درایە پاڵ خاتوو عائیشە ﵂ و ئامۆژگارییەکەی ئیمامی عەلی لە بەرژەوەندی خاتوو عائیشە بوو نەك خوانەکردە تەشهیرکردنی ناوی بووبێت، هەروەك نووسەر ئاماژەی پێدەکات کە گوایە:

١٠. نووسەر ئەڵێت: "ئەو قسەیەی ئیمامی عەلی وای کرد لە عائیشە کە هەمیشە بە چاوێکی دوژمنکارانەوە تەماشای بکات و داخ لەدڵ بێت بۆی، بە شێوەیەك تاوانباری بکات بە بەشداربوونی لە کوشتنی ئیمامی عوسماندا و سەرکردایەتی شەڕێکی کردووە دژ بە ئیمامی عەلی".[٣٣]

لە وەڵامدا ئەڵێین: هەناسەی شیعەگەرایی لەم نووسینەدا هەیە و نووسەریش بەهەڵەدا چووە لەو بۆچوون و شرۆڤەکردنەی کە دەربارەی ئەو شەڕە کردوویەتی، چونکە ڕوودانی ئەو شەڕە کە شەڕی (جەمەل)ی پێ ئەوترێ و خاتوو عائیشە فەرماندەی بووە بە یاوەری زوبەیری کوڕی عەووام و تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، لەلایەکی تریشەوە چوونە دەرەوەی ئیمامی عەلی لە مەدینە، بە هیوای هێور بوونەوەی وەزعی ناو مەدینە و دامرکانەوەی ئەو فیتنەیەی کە لە مەدینەدا ڕوویدا و ئیمامی عوسمانی تێدا شەهید کرا، کە زۆرینەی ئاژاوەگێڕ و بکوژانی عوسمان لەو سوپایەدا بوون، هەر بۆیە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە ئەو سوپایەی ڕێکخست بە یاوەری ئەو دوو هاوەڵە دەمڕاست و چاکەخوازە بە هیوای تۆڵەکردنەوە و سەندنی مافی خوێنی ئیمامی عوسمان و دروستکردنی ئاشتی و تەبایی لە نێوان موسڵماناندا و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، کە ئەگەر بێتو دەست لە بکوژانی ئیمام عوسمان هەڵگرن ئەوا بە هەمان شێوە کوشتنی خەلیفە زۆر ئاسان دەبێت بە لای خەڵکییەوە، کەمکردنەوە و تەسك کردنەوەی بوار لەبەردەم بکوژانی ئیمام عوسماندا تا بە ئاسانی و کەمترین قوربانی لەناو سوپاکەی ئیمام عەلی دا دەریان بهێنێت، بەڵام بەداخەوە ئاژاوەگێڕان کارەکەیان لەدەست سەندن و ئەو ڕووداوە ڕوویدا لە نێوان موسڵماناندا کە بووە هۆی دەربڕینی پەشیمانییەکی زۆر لە لایەن خاتوو عائیشەو ئیمامی عەلی و تەڵحە و زوبێرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت)، هەروەك

[33] لاپەڕە () لە کتێبی کچانی خوا.

**ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ: "عائیشە شەڕی نەکرد و بۆ شەڕیش نەچوویە دەرەوە، بەڵکو مەبەست لە چوونەدەرەوەی ئاشتی و تەبایی بوو لە نێوان موسڵماناندا، گومانیشی وابوو چوونەدەرەوەی مەسڵەحەت و بەرژەوەندی ئەبێت بۆ موسڵمانان، بەڵام پاشان بۆی دەرکەوت نەچوونەدەرەوەی باشتر بوو، هەرکاتێ باسی ئەو ڕووداوە بکرایە لە لایدا ئەوەندە ئەگریا سەرپۆشەکەی تەڕ ئەکرد بە فرمێسك و سەرجەم موسڵمانان پەشیمان بوون لەو شەڕەی ڕوویدا لە نێوانیاندا، بەڕاستی ڕۆژی جەمەل بۆ هەموویان شەڕکردن نەبوو، بەڵکو ڕوودانی ئەو شەڕە لەدەست ئەماندا نەما و توانای زاڵ بوونیان نەبوو بەسەریدا، هەروەك ئەگێڕنەوە لە ئیمامی عەلی کاتێك کە ئەبینێ پیاوەکان بە شمشێر ڕووبەڕوویەك ئەبنەوە ئەیووت: خۆزگە بیست ساڵ لەمەوبەر من بمردمایە".**[34]

**عائیشەش فەرمووی: خۆزگە بیست کوڕم لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببوایە و هەموویان وەك عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام ڕۆڵەڕۆم بۆ بکردنایە و لەوانە نەبوومابە کە بەشداری شەڕی (جەمەل)م بکردایە.**[35]

**کاتێك کە شەڕەکە کۆتایی هات ئیمامی عەلی هاتە لای خاتوو عائیشە و وتی: خوا لێت ببورێ، عائیشەش فەرمووی: لە تۆش، بەڕاستی هیچ نیەتێکم نەبوو تەنها ئاشتی و تەبایی نەبێت لە نێوان موسڵماناندا، پاشان ئیمامی عەلی رضي الله عنه هەموو پێداویستییەکی گەڕانەوەی وەك وڵاخی سواری و نان و ئاو و... هتد، ئامادە کرد بۆ خاتوو عائیشە و ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدا هاتبوون، چل ئافرەتی ناسراوی بەسرەی خستە خزمەتی.. ئەو بەیانییەی کە بڕیار بوو خاتوو عائیشە بەرەو مەدینە بگەڕێتەوە ئیمامی عەلی لەناو هەموو خەڵکەکەدا هاتە پێشەوە لە خاتوو عائیشە و ماڵئاواییان لە یەکتر کرد و عائیشە فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم! ئاساییە هەندێکمان سەرزەنشت و لۆمەی**

---

[34] فأمير المؤمنين علي ورد عنه عندما نظر وقد أخذت السيوف فأخذها من الرجال أنه قال: لوددت أني من قبل هذا بعشرين سنة/ الفتن – لنعيم بن حماد (١/ ٨٠).

[35] قالت عائشة: وددت أن لوكان لي عشرون ولداً من الرسول الله، وكلهم مثل عبدالرحمن بن حارث بن هشام، وأني ثكلتم، ولم يكن ماكان من يوم الجمل. التمهيد - للباقلاني، ص ٢٣٢.

هەندێکی تر مان بکەین بە هۆی کەمتەرخەمی و زیادەڕۆییەوە، بەڵام با ئیتر کەستان دەستدرێژی نەکاتە سەر کەسی ترتان و کۆتایی بە هەموو شتێك بهێنن، پاشان فەرمووی: وەڵڵاهی هیچ گرفتێك لە نێوان من و عەلی دا نییە و نەبووە، مەگەر شتانێکی نێوان بووك و خەزووران، عەلی یەکێکە لەو پیاوە ناوازە هەڵبژێراوانەی لای من.. دوای ئەویش عەلی فەرمووی: ئەی خەڵکینە وەڵڵاهی ڕاست ئەکا و چاکەشی بەرامبەر بە من وت، هیچ شتێك لە نێوانمان نەبووە، مەگەر ئەوە نەبێت کە فەرمووی، ئەو خێزانی پێغەمبەرەکەتانە ﷺ لە دونیاو لە قیامەتدا، پاش ئەوەی لە قسەکان بوونەوە دەستیان کرد بە ڕۆیشتن کە ڕۆژی شەممە ساڵی سی و شەشی کۆچی بوو، ئیمامی عەلی چەند میلێك لەگەڵیان ڕۆیشت و پاشان کوڕەکانیشی نارد لەگەڵیدا[36].

ئایا نواندانی ئەم مامەڵە جوانەی نێوان خاتوو عائیشە و ئیمامی عەلی چی تر ئەگەیەنێت پووچەڵی ئەو قسە هەڵبەستراوانەی نووسەر نەبێت؟ یان شارەزانەبوونی لە مێژووی ئیسلام؟ یان بێویژدانی بەخەرجدان نەبێت لە بەرانبەر ئەو شتانەدا بۆنی دینیان لێ دێت؟

١١- نووسەر ئەڵێت: "دووبەرەکی نێوان عائیشە و فاتیمە لەو ڕۆژەوە سەری هەڵداوە کە ئەبوبەکر بووەتە خەلیفەییەکەم و عەلی لێ بێبەش کراوە و فاتیمە دەستی داوەتە دژایەتی ئەبوبەکر و عائیشە و پشگیری لە مێردەکەی کردووە و بەیعەتیشیان پێنەداوە".

لە وەڵامدا ئەڵێین: دیسان هەناسەی شیعەگەرایی لە قسەکاندا هەیە و ئەوان بەردەوام باسی زەوتکردنی خیلافەت ئەکەن لە (عەلی) و منالی (عەلی)، پاشان نووسەر بە تەواوەتی نەزانی و بێ ئاگایی خۆی لەو مێژووە پڕ بەرەکەتە دەرئەخات و دەیەوێ لە ڕێگای نووسینەکانییەوە خەڵکیی چەواشە بکا لە دین و پەیڕەوانی دینی خوا، ئەگینا ئەو هەمووە درۆیە لە کوێ ئەهێنێ کە گوایە کێشمە کێش و ئاژاوە لە نێوانیاندا هەبووبێت، ئەوەندەی ئێمە بزانین و بەدوایدا گەڕابین لە سەرچاوە

[36] علي بن أبي طالب – شخصية وعصرة ص٣٩٥ – الدكتور محمد الصلابي.

باوەڕپێکراوەکاندا، هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەو دوو هاوەڵە نزیکە خۆشەویستەی پێغەمبەردا نەبووە ﷺ کە گەیشتبێتە ڕادەی یاخی بوون و ئاژاوەگێڕی، خۆ ئەگەر لە ژیانیاندا وەك مرۆڤ بەرخورد و قسەیەکی سارد ڕوویدا بێت لە بەرژەوەندی ئیسلام و بەرەوپێشبردنی کارەکانیاندا بووە، هەروەها بوونی ئەبوبەکری صدیق بە خەلیفەی یەکەمی موسڵمانان کارێك نەبووە لەدەست ئەبوبەکر و عائیشەدا بووبێ رضي الله عنه، بەڵکو زەرورەت و پێویستی موسڵمانان چۆکی بە ئەبوبەکری صدیق دادا کە ئەو بەرپرسیارێتییە گەورەیە قبوڵ بکات و ڕازی بێت پێی. سەبارەت بە خاتوو عائیشە ئەوە بوو لە کاتی نەخۆشییەکەی پێغەمبەردا ﷺ و فەرمان کردنی بە ئەبوبەکر بۆ بەرنوێژی کردنی موسڵمانان، خاتوو عائیشە بیانووی بۆ ئەهێنێتەوە کە با ئەبوبەکر نەبێت بە ئیمام و بەرنوێژی بکات، تا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی توڕە ئەبێ و ئەفەرموێ: (انکن صواحب یوسف مروا أبابکر فلیصل بالناس).[٣٧]

واتە: ئێوەش وەك براکانی یوسف وان، فەرمان بدەن بە ئەبوبەکر بەرنوێژیی ئەو خەڵکە بکات.

بەهەرحاڵ دوای ڕازی بوونی ئەبوبەکر و وەرگرتنی خیلافەت، وتارێك پێشکەش ئەکات، پاشان سوێندی خەڵکەکە ئەدات کە کێ پەشیمانە لەو بەیعەتە بابێتە پێشەوە.. لەو کاتەدا ئیمامی عەلی هەڵدەستێ و بە شمشێرەکەیەوە بەرەو ڕووی ئەچێت و قاچێکی ئەخاتە سەر بەرزایی مینبەرەکە و قاچەکەی تریشی لە خوارەوە و فەرمووی: (والله لا نقیلك ولا نستقیلك قدمك رسول الله فمن ذا یؤخرك؟) واتە: وەڵلاهی نە لات ئەبەین و نە داواش ئەکەین لابرێیت، پێغەمبەری خوا پێشی خستوویت، کێ ئەتوانێ دوات بخات. (قدمك رسول الله لدیننا ألا نرضاك لدنیانا، یعني بذلك حین قدمه للأمامة في الصلاة مع حضور).[٣٨] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کردویتی بە پێشەوا بۆ دینمان، ئێمە ڕازی نەبین پێشەوامان بیت بۆ دونیامان؟

---

[37] الانصار في العصر الراشدي ص ١٠٨

[38] ابوبكر الصديق – شخصية وعصرة – للدكتور علي محمد الصلابي – ص ١٢٠

مەبەستی ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا لە ژیانی خۆیدا تۆی کردە ئیمام بۆمان لە کاتێکدا کە خۆیشی ئامادە بوو.

حەزرەتی عەلی لە مینبەری کوفەدا وتار ئەخوێنێتەوە و پاشان دەست ئەکاتە وەسف و سەنای ئەبوبەکر و عومەر و داوای بەیعەتیان لێ دەکات کە خێرا دەستی بەیعەت درێژ بکەن بۆ ئەبوبەکر و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن و فەرمووی: کە بەڕاستی من یەکەم کەس بووم لە کوڕانی عەبدولموتەلیب دەستپێشخەریم کرد لەو بەیعەتەدا..

هەروەها لە چەندین جێگای تردا دەربارەی ئیمام عەلی ئەفەرموێت: ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ئیمامی ئەبوبەکر دانەبڕاوە و بە هەمیشەیی نوێژەکانی لە پشت سەرییەوە کردووە و هەر فەرمانێکیشی کردبێت گوێڕایەڵیی کردووە[39].

سەبارەت بە فاتیمە ﵂ کێشە و خیلافێکی نەبووە لەگەڵ ئیمام ئەبوبەکردا، بەڵکو تا ئەو ڕۆژەی ئەمرێ ڕازی ئەبێت لێی و خەلیفەش زۆربەی جار لە کاتی نەخۆشییەکەیدا سەردانی کردووە و دڵی داوەتەوە، تەنانەت خێزانەکەی کە (ئەسمای کچی عومەیس)ە تەرخان ئەکات بۆ خزمەتکردنی و تەداوی کردنی، کاتی مردنەکەشی هەر ئەسمای خێزانی ئەبوبەکر ئەیشوات و کفن و پێویستییەکانی بۆ تەواو ئەکات و خەلیفە ئەبوبەکر نوێژی مردووی بە سەرەوە ئەکات.

١٢ـ نووسەر ئەڵێت: "یەکێك لە هۆکارەکانی تری خەشم و قینی فاتیمە لە ئەبوبەکر ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ زەوییەکی هەبووە بە ناوی (فدك) و زەوتی کردووە و نەیداوەتەوە بە فاتیمە".

لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەگەر کەسێك داوای مافی خۆی بکات نەشورەییە و نەدەرخستنی خەشم و کینەیە، کاتێك فاتیمە ﵂ داوای ئەو زەوییە ئەکاتەوە، ئەبوبەکر ﵁ ئەم فەرموودەیەی یاد ئەخاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (لانورث ما ترکناه فهو

[39] البداية والنهاية (٥/٢٣٩)

صدقة)[٤٠] واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە بەجێمان هێشتووە نابێتە میرات، بەڵکو صەدەقەیە.

ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە حەزرەتی فاتیمە رضي الله عنها باسی نەکرد، پاش وەفاتی باوکیشی وردە وردە نەخۆشیی زۆری بۆ هێناو زیاتر بە هیوای گەیشتن بوو بە باوکی، نەك سەرقاڵ بوونی بە کێشمە کێشم و کاری سیاسی.

لە ڕاستیدا ئەم بابەتە زیاتر ئاو ئەکێشێ و ئێمەش نامانەوێ زۆر درێژەی بدەین لەبەر ئەوە داوا لە نووسەر و خوێنەر ئەکەین بۆ زیاتر ئاشنا بوونیان بەم بابەتە سەیری کتێبی "عەلی بن تالیب، للدکتور عەلی موحەممەد ئەلصەلابی" بکەن. ئەو کاتە دان ئەنێت بەوەی کە حاشا بکات لەو درۆ و قسە هەڵبەستراوانەی کە ئەیخەنە پاڵ ئەو نەوە ناوازەیە و حاشا بکات لە نووسەر و خامەیەك کە بە نەزانین و جەهلەوە دەم لە هەموو بابەتێك ئەکوتێت.

١٣ـ نووسەر ئەڵێت: "موحەممەد سوکایەتی بە عەقڵی فاتیمە کردووە کە پێی وتووە: من عائیشەم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بوێت"[٤١].

لە وەڵامدا ئەڵێین: سبحان الله لە عەقڵی نووسەر چەند ناکامڵە، ئایا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تەبایی و خۆشەویستی لە نێوان تاکەکانی خێزانەکەیدا دروست بکات سوکایەتی کردنە بە عەقڵیان؟ یا ئەوپەڕی دڵسۆزی و دانایی و حیکمەت بە خەرج دانە بۆیان..

دایکمان عائیشە رضي الله عنها خۆشەویسترین خێزان بووە لای پێغەمبەر ﷺ دوای خاتوو خەدیجە، هەرکات هاوەڵانی نیازی دیاریی بردنیان بووبێت بۆ پێغەمبەر ﷺ حەزیان کردووە لەو ڕۆژ و نۆبەتەی خاتوو عائیشەدا بیبەن، هەر بۆیە خێزانەکانی پێغەمبەر گلەیی ئەبەنە لای ئوم سەلەمە و پێی ئەڵێن کە بچێت بۆ لای پێغەمبەر و پێی بفەرموێ: کە ئێمەش خەیر و چاکەمان پێخۆشە با فەرمان بکات بە بڕواداران لە

---

[40] رواه عنه أبوبكر وعمر وعثمان وعلي وطلحة وزبير وعبدالرحمن بن عوف والعباس بن عبدالمطلب وأزواج النبي (رضي الله عنهم) وابوهريرة وحذيفة بن اليمان (رضي الله عنهم). سەرچاوە: ابوبكر الصديق / د. محمد الصلابي / ص- ١٥٢

[41] لاپەڕە ١١٥ لە کتێبی (کچانی خوا)

هەرکوێ و هەر جێگایەکدا بوو دیارییەکەی بۆ بهێنن و ماڵی خاتوو عائیشه تایبەت نەکەن بەو مەسەلەوە، ئوم سەلەمە ئەفەرموێ: دوو جار پێم وت، ڕووی وەرگێڕاو وەڵامی نەبوو، سەری سێهەم جار فەرمووی: "یا أم سلمة لاتؤذيني في عائشة فانه والله مانزل عليَّ الوحي في لحاف امرأة منكن غيرها".[٤٢] واته : ئوم سەلەمە داواتان لێ ئەكەم ئازارم مەدەن دەربارەی عائیشە، واتە گلەییم لێ مەکەن، وەڵڵاهی وەحی نەهاتووە بۆم لەسەر جێگای هیچ کامێك لە ئێوە بێجگە لەو، دیارە ئەم وەڵامەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە ئەگەیەنێت کە عائیشە زیاترە بەسەر ئەوانی تردا بە فەرمانی خوایی، کە ئەمەش وای کردووە ئەوەندە خۆشی بوێت، یاخود لە فەرموودەیەکدا کە شوعەیب لە زوهرییەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان بۆی باس کردم کە عائیشە خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یا عائش[٤٣]! هذا جبريل يقرأ عليك السلام). منیش وتم: "وعليه السلام ورحمة الله، قالت: وهو يرى ما لا أرى"، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەوی ئەبینی، بەڵام من نەم ئەبینی.

لەڕاستیدا خاتوو عائیشە رضي الله عنها هەمیشە هەوڵی داوە دڵی پێغەمبەری خوا ڕابگرێ و هەرچییەك کە ئەوی نیگەران کردووە نەیکا، هەروەك ئیبن سەعد ئەگێڕێتەوە کە جارێکیان لەگەڵ زەینەبدا کەوتە کێشەیەك بە ئامادەیی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام کاتێك پێغەمبەر تەماشایەکی توڕەیی کردن و هیچ قسەیەکی لەگەڵیان نەکرد، خێرا عائیشە بەئاگا بوویەوە لەو تەماشاکردنەی پێغەمبەر ﷺ خێراو دەسبەجێ بارودۆخەکەی گۆڕی و زەردەخەنە و پێکەنینی خستە ناو مەجلیسەکەوە، پێغەمبەریش ﷺ زەردە گرتی و فەرمووی: بەڕاستی کچی باوکی خۆیەتی.

لەڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ لە ژیانی ئەم ئافرەتە دانا و زانایە بدوێین و سوودمەندبین لێی، لە چەند لاپەڕەیەکی ئاوا کەمدا ناتوانین مافی خۆی پێ بدەین، بەڵکو وازی لێ

---

42 البخاري رقم — كتاب : فضائل الصحابة .

43 عائش : کورت کراوەی عائیشەیە و بۆ خۆشەویستی بەکاری هێناوە ﷺ.

ئەهێنین بۆ خوێنەر تا بەوپەڕی بەرچاوڕۆشنییەوە دراسەی ژیانی پڕ بەرەکەتی بکات و ئەو تەم و مژ و گومانانەی کە دروست کراوە لەسەری بڕەوێتەوە.[44]

هەروەها کۆتایی چرکەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەر لە ماڵی خاتوو عائیشەدا ئەبێ و هەر لەوێ و لە جێگاکەی خۆیدا گۆڕی پیرۆزی بۆ هەڵئەکەنن و ئەسپەردەی خاکی دەکەن، هەروەك خاتوو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە ژوورەکەی من و لاشەی قورس بوو، بە شێوەیەك هەموو گیانی داگیرسابوو، سەری کردە سەر کۆشم و ڕاکشا بەو پێیە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە باوەشی مندا بوو گیانی شیرینی بە خوا سپارد[45].

بێگومان کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ کارەساتێکی گەورە بوو لەسەر دڵی دایکمان عائیشە رضي الله عنها، بەڵام دڵخۆشی و ئارامییەك کە بە خۆی دەبەخشی، ڕۆیشتن و گەیشتنی بوو بە دیداری لە بەهەشتە پڕ لە ناز و نیعمەتەکەی خوادا.. خاتوو عائیشە یەکەم خێزانێکی پێغەمبەر بووە کە کچ بوو بێت.

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد ئەم تەمەنی هەژدە ساڵ دەبێت، بەڵام پاش پێغەمبەر تەمەنێکی درێژی پڕ بەرەکەتی بردە سەر تا شەوی سێشەمەی ١٧ی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨ی کۆچی لە تەمەنی (٦٦) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا..

## ٢ـ حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنها

حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب کوڕی نوفەیلە، کچی ئەو عومەرەی کە ئیسلام عیزەت و شکۆی بۆ گەڕایەوە بە هۆی موسڵمان بوونی، بە شێوەیەك ورەبەرزیی ڕووی کردە موسڵمانان و شکستی و بێ دەسەڵاتی بووە کاڵای باڵای بێباوەڕان، ئەو عومەرەی کە تاکانە کەسێك بوو لەو کاتەدا بتوانێ بە ئاشکراو بێ سڵەمینەوە کۆچ بکات بۆ

---

44 بۆ زانیاری زیاتر سەیری کتێبی: "نساء حول الرسول – محمود مهدي الاستانبولي / مصطفى أبولنصر" بکە.

45 ابن هشام (٣/٦٥٥)، البداية والنهاية (٥/ ٢٠٠)، تأريخ الطبري (٢/ ٢٢٢)

مەدینە و کەسیش توانای ڕووبەڕووبوونەوەی نەبێت لەگەڵیدا، دایکیشی ناوی زەینەبی کچی مەزعوونە.

حەفسە بە پێنج ساڵ بەر لە پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ لە دایك بووە و شووی کردووە بە خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی، لە سەرەتاکانی هاتنی پەیامی خوایی هەردوو هاوسەری بەڕێز باوەڕ ئەهێنن بە خواو بە پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ، ئەمانیش هەر وەك هاودین و هاوباوەڕانی خۆیان دەست هەڵئەگرن لە هەموو سامان و ماڵ و حەوانەوەیەکیان و بەرەو مەدینە کۆچ دەکەن، ئەوەبوو پاش ماوەیەکی کەم غەزای بەدر ڕوو دەدات، حەفسەش بە حوکمی ئەوەی لە بنەماڵەیەکی ئازاو چاونەترس و تێکۆشەردا پەروەردە بووە، یەکێك ئەبێت لە پێشمەرگە نەبەردەکانی ئەو غەزایە بە هاوەڵایەتی خونەیسی هاوسەری و عومەری باوکی و زەیدی مامی و هەرسێ خاڵۆکەی (عوسمان و عەبدوڵلا و قودامە)ی کوڕانی مەزعون و سائبی خاڵۆزای رضي الله عنه، پێغەمبەر و بڕواداران سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆیانەوە بینی و پەیمانی خوایان لەسەر هاتەدی (وكان حقًا علينا نصر المؤمنين[46])، دیارە چەند شەهید و بریندارێکیان دا، کە خونەیسی هاوسەری حەفسە یەکێك بوو لە بریندارەکان و چارەسەری برینەکەش مەحاڵ بوو، بەشێوەیەك رۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو لاوازی و چروساندنەوە دەچوو، تا خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ بەخشی و بەرەو ڕەزامەندی پەروەردگاری چوو رضي الله عنه، حەفسەش بێجگە لە تەسلیم بوونی بە قەزاو قەدەری خوای و ئارامگرتن کارێکی تری لەدەست نەدەهات.

دیارە ئەم بارە دەروونییە پڕ لە ئازارەی حەفسە کاری کردە سەر باوکی و هەمیشە خەریکی دڵدانەوەی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بوو بووە خولیایەك لەسەریدا کە چۆن بتوانێ سەختیی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە لەسەر دەروونی سووك بکات، هەر بەتەواوبوونی عیدەی کچەکەی کە عیدەی ژنی مێرد مردو چوار مانگ و دە شەوە، زۆر بە خێرایی هات بە خەیاڵیدا کە پێویستە مێردێکی چاك و شیاوی بۆ هەڵبژێرێت و بیکاتە هاوسەر و هاودەمی تا لەو ناڕەحەتییە ڕزگاری بکات، جا بابزانین کێ و چ

[46] سورة الروم — الأية ٤٦

**باوكێك توانیویێتی هەڵوێستی بەو شێوەی عومەری کوڕی خەتتاب بنوێنێ بەرانبەر بە کچەکەی؟ کێ ئەو پیاوەی بەو شێوەیە دروست کرد؟ بەڕاستی تەنها ئیسلامە کە بتوانێ پیاوانێکی وەها دروست بکات کە هەست و ڕۆحی بەرپرسیارێتی تیا دروست ببێ بەرانبەر بەهەر کەسێك کە مافی بە سەرییەوە بێت، پاشان بە بۆچوونی خۆی دووان لە هاوەڵ و دۆستە بە ئەمەکەکانی خۆی هەڵبژارد، تا یەکێکیان بکاتە هاوسەری کچە گەنجە بێوەژنەکەی کە ئەبوبەکری سدیق و عوسمانی کوڕی عەففان بوو ﷺ، ئەوەبوو سەرەتا چووە لای عوسمانی کوڕی عەففان کە هاوسەری ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ کە لە ژیاننامەیەکدا ئاماژەمان بەوەدا کە کاتی گەیشتنی موژدەی سەرکەوتنی موسڵمانان لە غەزای بەدردا عوسمان و هاوەڵانی خەریکی ئەسپەردە و بە خاك سپاردنی روقیە بوون (رەزای خوایان لێبێت)، پێی فەرموو: چۆنە بەلاتەوە ئەگەر حەفسە مارە بکەم لێت؟ ئیمام عوسمان کەمێك وەستا و پاشان فەرمووی: با کەمێك بیری لێ بکەمەوە، دیار بوو بیرکردنەوەکەی ئیمام عوسمان ئەوە بوو کە زۆر بەلایەوە سەخت بوو، کە پەیوەندیی زاواو خەزووری لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆتایی پێ بێت، چونکە تەنها کوڕێکیشی هەبوو لە نەوەی پێغەمبەر ئەویشی لەدەست دابوو، پاش چەند ڕۆژێك وەڵامەکەی ئیمام عومەری دایەوە بەوەی کە جارێ بەنیازی ژنهێنان نییە و ئیمام عومەری بێ هیوا کرد. هەر بۆیە ڕووی لە ئەبوبەکری صدیق ناو فەرمووی: ئەمەوێت حەفسە مارە بکەم لێت؟ ئەبوبەکریش بێدەنگیی باڵی کێشا بە سەریا و هیچ وەڵامێکی پێ نەدرابوویەوە. پاشان ئیمام عومەر بە دڵێکی شکاوەوە بەرەو لای پێغەمبەر ڕۆیشت و باسەکەی بۆ گێڕایەوە کە هەڵوێستی ئیمام عوسمان چۆن بووە بەرانبەری (رەزای خوایان لێ بێ).**

**پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنە گرتی و فەرمووی: (یتزوج حفصة من هو خير من عثمان، ويتزوج عثمان من هي خير من حفصة)[47] واتە: حەفسە شوو ئەکات بە کەسێك**

[47] رواه البخارى في النكاح، باب عرض الانسان إبنه أو أخته على أهل الخير (٦/ ١٢٠) والنسائي فى النكاح باب النكاح الرجل ابنة الكبيرة (٦/ ٨٣) وابن سعد في الطبقات (٨/ ٨٢) والاصابة (٨/ ٥١) والاستيعاب (٤/ ١٨١١)

**کە لە عوسمان چاکتر بێت، عوسمانیش ژنێك ئەهێنێ کە لە حەفسە چاکتر بێت، لێرەدا فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستێکی ڕوونی دا بەدەستەوە ئەوە بوو لەدوایدا عوسمان (کلسوم)ی مارە کرد و پێغەمبەریش ﷺ حەفسەی مارە کرد و بوو بە دایکی ئیمانداران، پێغەمبەر ﷺ بەم فەرموودەیە ئیمامی عومەری دڵخۆش کرد و پەیوەندیی نێوان خۆی و هاوەڵانی زیاتر بەتین کرد.**

**با ئەوەش لەیاد نەکەین کە پاش مارەبڕینی حەفسە لە پێغەمبەر ﷺ ئیمامی ئەبوبەکر هاتە لای عومەر و پێی فەرموو: ئەزانم شتێك لەدڵدا دروست بووە بەرانبەرم، لەوەی کە وەڵامم نەدایتەوە، ئیمامی عومەر فەرمووی بەڵێ وایە، ئەویش فەرمووی: جارێکیان پێغەمبەری خوا لای من باسی حەفصەی کرد، منیش نەئەکرا ئەو نهێنییە بدرکێنم.. خۆ ئەگەر پێغەمبەر وازی لەو کارە بهێنایە ئەوا من بە خۆشحاڵییەوە ڕازی ئەبووم پێی و هیچ ڕێگرێك نەبوو لە وەڵام دانەوەدا[٤٨].**

**ئابەو شێوەیە کۆمەڵی هاوەڵان (صحابة) دڵی یەکتریان مەبەست بووە و هەوڵی زیاتر لە یەکتر نزیك بوونەوەیان داوە لە مانگی شەعبانی ساڵی سێهەمی کۆچی حەفسە گوێزرایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بوو بە دایکی ئیمانداران، هەر لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ خاوەنی دوو هاوسەری تر بوو (سەودە و عائیشە) ڕەزای خوایان لێ بێت.**

**ئاشکرایە پەیوەندییەکی بەتین هەبوو لە نێوان عائیشە و حەفسە بە حوکمی هاوتەنی یان هاوشانی یەکتر کە کچانی هەردوو هاوەڵی جوامێر و خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر و عومەر بوون (ڕەزای خوایان لێ بێت).**

**لەبەر ئەوە ئیمامی عومەر خوێندەوار بووە، گرنگییەکی زۆریشی بە حەفسە داوە لە بواری خوێندن و نووسیندا، بە هۆی ئەو خوێندەوارییەی کە بوویەتی و بوونیشی بە هاوسەری پێغەمبەر و زیاتر تەکلیفی ئافرەتانی موسڵمان بە سەرییەوە گرنگییەکی زۆری بەفێربوونی زانستەکانی قورئان و فیقە و فەرموودە و هونەری ڕەوشت و هۆنراوە و.. هتد دەدا، بە شێوەیەك کە بوو بە وتاربێژێکی بە توانا لە قسە و**

---

48 (ولا تجد علي ياعمر فان رسول الله ﷺ كان قد ذكر حفصة، فلم اكن لافشي سر رسول الله ﷺ ولو تركها لتزوجتها). أخرجه البخاري في النكاح، (٦/ ١٣٠).

گفتوگۆدا، هەروەها مەرجەعێك بوو بۆ كاروبارە تایبەتییەكانی ژنان، زۆربەی جار ئیمامی عومەری باوكی ﵁ ئەچووە لای هەر پرسیار و وەڵامێكی لە بارەی ژنانەوە پێویست بوایە لەوی دەكرد، هەروەها شەست فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت كردووە.

تا بڵێی ئافرەتێكی زۆر لە خواترس بوو بە شێوەیەك زۆربەی ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو، بە شەویش شەونوێژی لە كیس نەدەچوو، كە جبریل دەربارەی دەفەرموێ: (انها صوامة قوامة وهي زوجتك في الجنة).[49]

لەگەڵ ئەو هەموو عیبادەت و خواپەرستییەشدا هەمیشە دەستی بە هەژاران و منداڵانی بێ باوك و ئافرەتانی بێوەژنەوە بووە، بەتایبەت دوای لەدنیا دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئەو موچەیەی لە (بيت المال) بۆی بڕابوویەوە لەو یارمەتییانەدا خەرجی دەكرد، هەموو ساڵێكیش حەجی ماڵی خوای دەكرد و پاشان ئەچووە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ و باوكی و ئەبوبەكر ﵁، ئاشكرایە كە ئەم ئافرەتە فیداكارە قەڵایەكی قایم بوو بۆ پاریزگاری كردنی ئەو (مصحف)ەی قورئانی پیرۆز كە دوای غەزای ئوحود و لە دەستدانی حەفتا لە هاوەڵی قورئان لەبەر (حافظ القرآن) نووسرایەوە و لە دوای وەفاتی ئیمامی ئەبوبەكر، درایە دەست ئەمیری تازە عومەری كوڕی خەتتاب ﵁، پاش شەهیدبوونی ئیمامی عومەریش قورئانەكەیان دایە دەست دایكمان حەفسە و بە پارێزراوی هەڵگیرا تا ئەو كاتەی عوسمانی كوڕی عەففان خیلافەتی گرتە دەست و هەواڵی جۆراو جۆری لە شێوازی قورئان خوێندندا پێدەگەیشت، تا ناچار بوو داوای قورئانەكە لە حەفسە بكات و بە ئەمانەت بۆی بهێنێ بۆ ئەوەی چەندین قورئانی لەسەر بگرنەوە و هەر وڵات و ویلایەتێك نوسخەیەكی بۆ بنێرێت و ئوممەتی ئیسلامیی یەك بخات لە خوێندنەوە و لێكدانەوەی ئایەتەكانی قورئان، پاشان قورئانە ئەسڵییەكەیان ناردەوە بۆ دایكی ئیمانداران خاتوو حەفسە (خوای لێ ڕازی بێت).

[49] هذا الحديث صحيح ، أخرجه ابوداود في النكاح ، باب في المراجعة برقم / ٢٢٨٣
وابن ماجه برقم / ٢٠١٦

ئەم خاتوونە بەڕێزە هەموو ژیانی تەرخان كردبوو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواو بەدەمەوەچوونی هەموو موسڵمانان تا تەمەنی پیرۆزی بەرەو كۆتایی ئەڕوات لە سەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیاندا و لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا گیانی پاكی بە خوای گەورە ئەسپێرێ و مەروانی كوڕی حەكەم كە لەو كاتەدا ئەمیری مەدینە ئەبێت نوێژی مردووی بەسەرەوە ئەكات و هەر لەوێ لە بەقیع بە خاكی ئەسپێرن (رەزای خوا لە هەموویان بێت).

**سێهەم: تەواو كردنی یاساو بنەما دەستورییەكانی ئیسلام (أكتمال التشريع)**

ئامانجێكی تری فرەژنی پێغەمبەری خوا ﷺ بریتی بوو لە جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی شەریعەتی ئیسلام، یەكێك لە هۆكارە گرنگەكانی فرەژنی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك زانایانی ئیسلام لێی كۆڵیونەتەوە بۆ چەند مەبەستێكی یاسایی بووە، كە یەكێك لەو مەبەستانەی هەڵوەشاندنەوەی دەستوری بە كوڕ كردن بووە (نظام التبنـي)، ئەم دەستورە لەناو عەرەبەكانداو پێش هاتنی پەیامی خوایی خوویەكی بەربڵاو بووە لە ناویاندا، كە كوڕێكیان هەڵدەبژارد، ئایا بە كڕین بوایە یا بە دیلگرتنی بوایە لە كاتی ڕووبەڕووبوونەوەی خێڵە عەرەبنشینەكاندا و دەیانكردە كوڕی خۆیان و هەموو مافێكی كوڕێتیان پێ دەبەخشی، تەنانەت لە كاتی میرات بەشكردنیشدا. ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بەندەیەكی دەبێت كە خاتوو خەدیجە (رەزای خوای لێبێت) پاش مردنی جگەرگۆشەكەی و نائومێد بوونی لە منداڵ بوون ئەیكڕێ و ئەیكاتە دیاری هاوسەری خۆشەویست و بە ئەمەكی موحەممەد ﷺ، بەندەكەش ناوی (زەید)ە نەك (زاید)، كە نووسەر بە نەشارەزایی ئەڵێ ناوی (زاید) بووە!! پاش یەك دوو ساڵ مانەوەی لای موحەممەد، خزمەكانی دێن بە شوێنیدا و داوای دەكەنەوە بە هەر نرخێك بێت، موحەممەد هەروەكو عادەتە جوانەكانی خۆی هیچ بڕیارێك نادات، بەڵكو زەید سەرپشك دەكات لە نێوان خۆی و خزمەكانیدا تا یەكێكیان هەڵبژێرێت. دیارە بەپێی وردبوونەوە لە ژیانی ئەو بەڕێزەو خۆشەویستییەكی بێ سنووری موحەممەد لە دڵیدا نەیتوانیوە دەستبەرداری ببێت، هەر بۆیە موحەممەدی هەڵبژاردووە و ماڵئاوایی لە خزمەكانی كردووە، پاش ئەوەی

**پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی کردە کوڕی خۆی و هەر بەهەمان خووی عەرەبەکان فەرمووی: (أشهد أن زيداً ابني يرثني وأرثه)[50].**

**ئیتر لە دوای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ زەیدی کوڕی حاریسە گۆڕا بۆ زەیدی کوڕی موحەممەد، هەروەك عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەفەرموێ: ئێمە زەیدی کوڕی حاریسەمان هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرد تا ئایەتی (أدعوهم لآبائهم) دابەزی[51].**

**کەواتە هەر یاسایەك خزمەت بە درۆ بکات خوای گەورە قەدەغەو یاساغی دەکات و ویستی وایە کۆمەڵگای ئیسلامیی لەسەر ڕاستی بنیات بنرێت و سیمای درۆ لە هەموو بچوك و گەورەیەکدا بنبڕ بکرێت (هو أقسط عند الله). پاشان زۆر بە ڕاشکاوانەو لە ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەیدات بە گوێی هەموو خەڵکیدا کە (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً)[52] واتە: موحەممەد باوکی هیچ پیاوێك لە پیاوەکانتان نییە، بەڵکو پێغەمبەری خوایەو کۆتا پێغەمبەرە، خوای گەورەش ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.**

**کەواتە هەر بەم ئایەتە دەستوری بە کوڕ کردنەکە هەڵوەشایەوەو هیچ پەیوەندییەکی باوك و کوڕێتی لە نێوان (موحەممەد و زید)دا نەما، تەنها خۆشەویستی و برایەتی دینی نەبێت.**

**خۆشەویستییەکیش بە شێوەیەك بوو پێغەمبەر ﷺ چاکترین و بەنرخترین خزمی خۆی بۆ بخوازێت کە: زەینەبی کچی جەحشە رضي الله عنه.**

**زەینەب کچی جەحشی کوڕی ڕەبابی کوڕی یەعمورە، دایکی ناوی ئومەیمەی کچی عەبدولموتەلیب بوو، ئەبێتە پوری پێغەمبەر ﷺ و زەینەب پورزای پێغەمبەر ئەبێت.**

**ئەم بنەماڵە بەڕێزە هەر لە سەرەتای هاتنی پەیامی خوایی زۆر بە لێبڕاوانە باوەڕیان هێناو تووشی جۆرەها ئەشکەنجەو ئازار هاتن لە پێناو گەیاندنی پەیامی بەرزی**

---

[50] لە کتێبی (تعدد الزوجات في الاسلام) عبدالله ناصح علوان- ص٧١

[51] أخرج البخاري عن ابن عمر قال: (ماكان ندعوا زيد بن حارثه الا زيد بن محمد حتى نزل: ادعوهم لابائهم).

[52] سورة الاحزاب الاية (٤٠)

خواییدا. یەکێك لەو ئازارانە دەست هەڵگرتنیان بوو لەو سامانو دارایی‌و خانوو و ماڵە جوانەی کە جێی سەرنجی هەمووە خەڵکی ناوچەکە بووە لە ڕازاوەیی‌و دڵفڕێنی، بە شێوەیەك کە هەر پاش کۆچ کردنیان بۆ مەدینە دەسبەجێ ئەبوسوفیان هەڵیکوتایە سەر مامەڵەکەیان‌و داگیری کرد. زەینەب لەگەڵ ئەو هەموو قەدرو ڕێزو بنەماڵە بەرزەی کە هەیبوو، خاوەنی بەژن‌و باڵاو جوانییەکی کەموێنە بوو، کە زۆربەی گەنج و لاوی هاوشان و هاوتەمەنی خۆی خوازیاری خواستنی بوون، بەڵام کەس نەیدەزانی قەدەری خوایی بەرەو کوێی دەباو چ پاشەڕۆژێك چاوەڕوانی لێدەکات؟ سەرەتا باسمان کرد کە (زەید) لە دڵی پێغەمبەردا ﷺ زۆر خۆشەویست بوو، خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتی جوانی وەك: ئازایەتی‌و نەبەردی‌و ئەمەکداری و ڕەوانبێژییەکی بێ هاوتابوو، لە سەرو و ئەمانەشەوە خوای گەورە شایەتی ئیمانی بۆ دەدات کە ئەفەرموێ (أنعم الله عليه)، واتە: خوای گەورە نیعمەتی ئیمانی ڕشت بە سەریا، هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەر سریەیەکدا بینارداية ئەیکردە سەرکردە و فەرماندەی زۆرینەی پیاوە گەورە و خاوەن بنەماڵەکانی قورەیش.

پێغەمبەر ﷺ وەك دڵسۆزێکی بیری دەکردەوە کە (زەید) پێویستی بە ماڵ‌و ئارامگایەك هەیە تێیدا بحەوێتەوە و بیکاتە خاوەنی ماڵ و منداڵێك کە مایەی کامەرانی و خۆشحاڵی هەموو پیاوێکە.

هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ نزیکترین و بەرزترین کچ و خانەوادەی بۆ هەڵبژارد تا بیکاتە خێزان و خەزووران بۆی، زیاتر بەهرەمەندی بکات لە سۆزو خۆشەویستی خۆی و نەهێشتنی جیاوازییە ڕەگەزی و ڕەچەڵەکییەکانی نێوان تاکە تاکەی ئومەتەکەی‌و لەخواترسان بە پلەی یەکەم لە هاوشانی بزانن‌و پێشیان ڕابگەیەنێت کە هەر هەموویان یەکسانن‌و ڕۆڵەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ ناردییە لای زەینەب‌و پێی فەرموو: (إني أريدُ أن أزوجك زيد بن حارثه، فاني قد رضيته لك). واتە: من ئەمەوێ تۆ بخوازم بۆ زەیدی کوڕی حاریسە، بە ڕاستی من بە شایانی ئەزانم ڕازیم لێی، ئەویش وتی: بەڵام من پێی ڕازی نیم من لەو بنەماڵە باشترم، کچی پوری خۆتم و ناتوانم ئەو کارە بکەم، ئینجا ئەو ئایەتە

دابه‌زییه سه‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً )[53] واته‌: بۆ هیچ پیاو و ئافره‌تێكی ئیماندار نییه‌، كاتێك خواو پێغه‌مبه‌ری خوا بڕیاری كارێكیان دا، ئه‌وان ده‌ستبژێری بكه‌ن و مافی هه‌ڵبژاردنیان نییه‌، هه‌ر كه‌سێك سه‌رپێچی له‌ فه‌رمانی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا بكات، ئه‌وه‌ به‌ڕاستی گومڕا بووه‌ و لایداوه‌.. پاش دابه‌زینی ئه‌م ئایه‌ته‌ زه‌ینه‌ب وتی به‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌وا گوێڕایه‌ڵیت ئه‌كه‌م و چ كارێكت مه‌به‌سته‌ به‌ جێی بهێنه‌، پاشان پێغه‌مبه‌ر ماره‌ی بڕی له‌ زه‌یدو گوێزایانه‌وه‌ به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ له‌ ناویاندا باو بووه‌.. ئاوات و خه‌ونه‌كانی زه‌ید به‌ خه‌یاڵی خۆی هاتۆته‌ دی و ئیتر ئه‌بێته‌ خاوه‌نی ماڵێكی پڕ له‌ سۆزو خۆشه‌ویستی.. به‌ڵام هاتنه‌ دی ئه‌و خه‌ونه‌ زۆر دوور بوو، به‌ڕاستی وه‌ك سه‌رابێك بوو بۆی، تا زیاتر به‌ره‌و ڕووی بڕۆشتایه‌ زیاتر تووشی غه‌م و خه‌فه‌ت و ماندوێتی ده‌بوو، چونكه‌ ڕه‌زامه‌ندییه‌كه‌ی زه‌ینه‌ب به‌ ته‌نها زاره‌كی بوو، ئه‌گینا به‌ دڵ قه‌ناعه‌تی به‌و شوو كردنه‌ نه‌بوو، به‌ڵام به‌پێچه‌وانه‌وه‌ به‌هۆی ئه‌و ده‌مارگیری و جیاوازی هاوشانییه‌ی كه‌ له‌ نێوانیاندا هه‌بوو نه‌یده‌توانی، به‌ڵكو قسه‌ی ساردو ڕه‌خنه‌و ته‌شه‌ری لێده‌دا به‌شێوه‌یه‌ك زه‌یدی زۆر بێزار كردبوو، تا وای لێهات كه‌وته‌ ده‌ربڕینی بێزاری و شكات كردنی لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ ته‌نانه‌ت جیابوونه‌وه‌ش لێی، پێغه‌مبه‌ریش ئامۆژگاری ئه‌كردو داوای لێ ئه‌كرد كه‌ دان به‌خۆیدا بگرێت، به‌ڵكو باش ببێت، (أمسك عليك زوجك واتقِ الله) واته‌: ده‌ست بگره‌ به‌ خێزانه‌كه‌ته‌وه‌و له‌ خوا بترسه‌، واته‌ جارێ بیر له‌ ته‌ڵاقدانی مه‌كه‌ره‌وه‌، چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ شتێك هه‌بوو له‌دڵیدا كه‌ خوای گه‌وره‌ ده‌ستووری به‌ كوڕ كردنی پێ هه‌ڵئه‌وه‌شێنێته‌وه‌، له‌وه‌ش ده‌ترسا كه‌ كاتی نه‌هاتبێ و بكه‌وێته‌ به‌ر ڕه‌خنه‌و لۆمه‌ی بێ باوه‌ڕان.

به‌ڵام زه‌ید وه‌ك مرۆڤێك كه‌ توانایه‌كی دیاری كراوی هه‌یه‌و له‌وه‌ زیاتر به‌رگه‌ی ئه‌و هه‌موو لۆمه‌ و قسه‌ و سه‌رزه‌نشته‌ی زه‌ینه‌ب ناگرێت، هه‌ر بۆیه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺی ناچار كرد كه‌ ئیزنی بدات تا له‌ زه‌ینه‌ب جیا ببێته‌وه‌، پێغه‌مبه‌ریش به‌ناچاری ئیزنی

[53] سورة الاحزاب الاية (٣٦)

داو ئەویش بە خێرایی گەڕایەوە ماڵەوەو هەواڵەكەی پێ ڕاگەیاند كە پێغەمبەر ﷺ ئیزنی داوە بەجیا بوونەوەی لێیو زەینەبی تەڵاقدا و هەردووكیان ڕزگاریان بوو لەو ژیانە نیمچە دۆزەخەی كە تێیدا دەژیان.

پاشان زەید گەڕایەوە لای پێغەمبەر و زەینەب لە ماڵەوە مایەوەو كات و ساتەكانی ڕۆژانی عیدەكەی بە نوێژ و ڕۆژوو و قورئان خوێندنەوە بردە سەرو داوای لە خوا ئەكرد كە زایەی نەكات، پاش تەواو بوونی عیدەكەی كە سێ مانگ بوو، واتە شەرعەن توانای شوو كردنەوەی هەبوو، هەر لەو كاتو ساتەدا سەفیری خوایی كە جوبرەئیل بوو، بە نامەیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا كە خوای گەورە زەینەبی لێ مارە كردوویت، پاش ئەوەی كە زەید پێویستی بەو ئافرەتە نەماو تەڵاقی دا، كە ئەفەرموێت (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً * مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَراً مَّقْدُوراً * الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيباً)[٥٤]. واتە: كاتێك بەو كەسە دەڵێیت: كە خوا نیعمەتی (ئیمانی) ڕشتووە بە سەریداو تۆش نیعمەتت ڕشتووە بە سەریا (كە ئازادكردنی بوو لە بەندایەتی) ژنەكەت لای خۆت ڕابگرەو لە خوا بترسە، لە دەروونی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە كە خوا ئاشكرای دەكات. ئەترسی لە لۆمەی خەڵك، كە تەنها خوا شایانی ئەوەیە لێی بترسیت، كاتێك زەید پێویستی بەو ئافرەتە نەماو تەڵاقی دا، ئێمە لە تۆمان مارە كرد، بۆ ئەوەی هیچ نەنگیو نیگەرانییەك لەسەر ئیمانداران نەمێنێ لە مارەكردنەوەی ژنی بەناو كوڕەكانیان، كاتێك بەناو كوڕەكانیان تەڵاقی دان. بەڕاستی فەرمانی خوا بەرپەرچ بوونەوەی نییەو كراوە. هیچ تاوانو نەنگییەك لەسەر پێغەمبەر ﷺ نییە لەو بەشەی خوا بۆی بڕیار داوە، ئەم جۆرە بڕیاردانەش سوننەتی (باو) بووە بۆ كەسانێك كە پێش ئەم ڕابردوون، فەرمانو بڕیاری خوا

[54] سورة الاحزاب الآية: ٣٧ - ٣٨ - ٣٩ .

نووسراوەو جێبەجێ كراوە، ئەو كەسانەی پەیامەكەی خوا دەگەیەنن، لەو دەترسن و لە كەسی تر ناترسن، خوا بەسە كە موحاسەبەی بەندەكانی بكات.

كەواتە هەر بە ئایەتەكەدا دیارە كە خوای گەورە بڕیاری دروست كردنو هەڵوەشاندنەوەی ئەو پرۆسە هاوسەرگیرییەی داوە لەبەر ئەو حیكمەتە گەورەیە كە هەڵوەشاندنەوەی یاسای بە كوڕ كردن بوو (نظام التبني).

كاتێك كە جبریل لە گەیاندنی ئەركەكەی بوویەوە، دەسبەجێ پێغەمبەر ﷺ چوو بەدەم جێبەجێ كردنی فەرمانە خواییەكەوە و زەیدی نارده خوازبێنی و پێی فەرموو: (إذهب فاذكرها علي) واتە: بڕۆ باسی منی بۆ بكەو فەرمانەكەی منی پێ بگەیەنە، چونكە ئیتر بۆ پێغەمبەر ﷺ نەبوو دواخستنی ئەو كارەو كاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەستورە هاتبوو، كە بە پێی ئەو یاسایە بۆ هیچ كەسێك نەبوو، كە خێزانی یا كچانی ئەو كوڕانەی كە بە زار كردوونیان بە كوڕی خۆیان مارە بكەن نە لە خۆیان نە لە كوڕەكانیان، هەر بۆیە خوای گەورە بەو یاسایە ڕازی نییە. دیارە كەسیش خاوەنی ئەو بوێرییە نییە كە ئەو یاسایە هەڵوەشێنێتەوە، چونكە كارێكی گرانەو ساڵەهای ساڵە پیادە دەكرێت، هەر بۆیە ویستی خوا وابوو زەینەب ببێتە خێزانی زەیدو پاشان ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ تا خەڵكیی یاسای ڕاست و دروست لە جێگای ئەو یاسا نادروستو ناڕەوایەدا ببینێ، ئاشكرایە كە خوای گەورە خۆی مارەی كردەوە لە پێغەمبەر ﷺ نەك خوا نەكردە پێغەمبەر ویستو ئارەزووی كاری وەهای بووبێت، هەروەكو نووسەرو چەندین بەناو ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆ ئەو تاوانە گەورەیە ئەخەنە ئەستۆی خۆیانو لە هەمان كاتیشدا جەهل و نەزانییان ئەكەوێتە بەر دیدی خوێنەران، خۆ ئەگەر ویستی كاری وەهای ببوایە، ئەوا زەینەب ئافرەتێكی غەریبە نەبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ و نەیدیبێ، بەڵكو پورزای خۆی بووەو ماڵی پوریشی زۆر خۆشحاڵ دەبوون بەو كارە، بەڵام لە هەمان كاتیشدا پێغەمبەر بێزاریو توڕەییش ئەیگرێ كاتێك كە دەست ئەنێن بە ڕوویەوە لە داخوازی كردنی دا بۆ زەید، حیكمەت و دانایی پێغەمبەر ﷺ لە ناردنی زەید كە مێردی پێشووی بوو بۆ داخوازی كردنی و گەیاندنی راسپاردەكە بە زەینەب:

١. تا بۆ پێغەمبەر ﷺ دەرکەوێت کە ئایا زەید هیچ شتێکی لەدڵدا ماوە بۆ زەینەب یان نا؟

٢. تا بۆ هەموو خەڵك دەرکەوێت کە تەڵاق دانی زەینەب لە لایەن زەیدەوە بە زۆر نەبووە، خۆی تەنگی بە پێغەمبەر هەڵچنی بوو لە تەڵاق دانو جیابوونەوەی.

هەروەك خوای گەورە پەردەی لەسەر نهێنییەکان هەڵدایەوەو ڕاستیی باسو بابەتەکەی خستەڕوو.. ئەوە بوو زەید بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ چوو بەدەم گەیاندنی ڕاسپاردەکەوەو ئەڵێت: کە چووم بە زەینەب بڵێم، دەبینم هەویر دەشێلێ، زەینەب زۆر لەبەرچاوم گەورەو ڕێزدار بوو، بەشێوەیەك نەمتوانی سەر بەرز بکەمەوەو ڕووبەڕوو پێی بڵێم، ئینجا پاشەو پاش گەڕامەوەو پشتم هەڵکردو وتم: ئەی زەینەب پێغەمبەری خوا منی ناردووە ئەو باسەت پێ ڕابگەیەنم، ئەویش وتی: من هیچ ناکەم تا نوێژی ئیستیخارە نەکەم، جا هەستا بۆ نوێژەکەی، ئایەتی قورئان هاتە خوارەوە بەو شێوەیەی کە بیستمان، هاوکات پێغەمبەر ﷺ بە بێ پرسو ئیزن خواستن چوو بۆ ماڵی زەینەب، چونکە زەواجەکە بە فەرمانی خوای گەورە بڕیاری لێ درا بوو[55].

ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەعوەتی شایی بۆ دەکات و نان و گۆشت خواردنی دەعوەتەکەی دەبێت، ژنان بەشداری شاییەکە دەکەن و پاش نان خواردن هەڵدەستنو دەڕۆنەوە، بە دوای ئەمانیشدا پیاوان هەڵدەستن، هەندێکیان نەبێت دەمێننەوە بۆ دەمەتەقێو کات بەسەربردن، دیارە ئەم جۆرە باوو خووەش ئەبێتە هۆی ماندوو بوونو بێزاری پێغەمبەر ﷺ و هەموو خاوەن ماڵێك کە ڕیعایەتی نەکردبێت، هەر بۆیە لەم کاتە

[55] اخرج الامام مسلم في صحيحه حدثنا محمد بن حاتم، حدثنا بهز وحدثني محمد بن رافع، حدثنا ابو النضر هاشم بن القاسم، قالا جميعاً: حدثنا سليمان بن المغيرة عن ثابت عن أنس هذا حديث بهز، قال: لما انقضت عدة زينب قال رسول الله ﷺ لزيد فاذكرها علي قال: فانطلق زيد حتى أتاها وهي تخمر عجينها، قال: فلما رأيتها عظمت في صدري أي هابها، لأن رسول الله ﷺ يريد تزوجها، حتى ما استطيع أنظر اليها أن رسول الله ذكرها فوليتها ظهري، ونكصت على عقبي، فقلت: يازينب ! أرسل رسول الله يذكرك، قالت: ما أنا بصانعة شيئاً حتى أوامر ربي، فقامت الى مسجدها ونزل القرآن، وجاء رسول الله ﷺ فدخل عليها بفر إذن لإن الزواج انعقد بالأمر إلهي.

پیرۆزەشدا هەندێ لەو ئادابە تایبەتیانەی تایبەت بە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ دابەزییە سەر ئیماندارا ن كە:

١ـ ئادابی چوونە ماڵی پێغەمبەر خوا ﷺ لە كاتی دەعوەتو نان خواردنو شێوازی هەڵسو كەوتیان (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيماً)[56] واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە نەچنە ماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ كاتێك نەبێت كە مۆڵەت درابن و بانگ كرابن بۆ نان خواردن، چاوەڕێی پێگەیشتنو ئامادەبوونی خواردن مەكەن، بەلام ئەگەر بانگیان كردن بڕۆن، ئەگەر نانتان خوارد بلاوەی لێ بكەن، دامەنیشن بۆ دەمەتەقێو قسەو باس، چونكە بەڕاستی ئەو مانەوەیە ئازاری پێغەمبەر دەدات و شەرم دەكات پێتان بلێت، بەلام خوا شەرم ناكات لە فەرمان كردن بەڕاستیو وتنی شتی حەق.

بێگومان ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەركو زەحمەتی زۆری لەسەر بووە، لە هەموو جۆرە خەڵكێك ڕووی تێ كردووە، وەك خزمو ناسراوو هاوەڵانو نوێنەرەكانی شارو دێهاتەكان لە بێ باوەڕو بڕوادارەكان، بەشێوەیەك ماوەی پشوودانو دانیشتنی خێزانی ماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ زۆر تەسك بوو بوویەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ كەس كەم سەلیقەو بێ كار تەنها بە مەبەستی دەمەتەقێو كات بەسەر بردن دەچوونو دەمانەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆ ڕێكخستنی جۆری پەیوەندیو هاتوچۆكردنی ماڵی پێغەمبەر دابەزی.

٢ـ ئادابی گێڕانەوەی پەردە (حجاب) لە نێوان خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ و كەسانی غەریبو نامەحرەمدا.

---

[56] سورة الاحزاب (٥٣).

ئیمامی بوخاری له‌ ئه‌نه‌سی كوڕی مالیكه‌وه‌ ئه‌گێڕێته‌وه‌: عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب فه‌رموویه‌تی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا چاك‌و خراپ دێته‌ ماڵی جه‌نابت، بریا فه‌رمانت بكردایه‌ به‌ دایكی ئیمانداران كه‌ په‌رده‌ بگێرنه‌وه‌، هاوكات خوای گه‌وره‌ ئایه‌تی حجاب دابه‌زاند[57] (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ).

واته‌: ئه‌گه‌ر داوای كه‌ل و په‌لێكتان له‌ خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كرد له‌ پشتی په‌رده‌ داوایان لێ بكه‌ن، چونكه‌ ئه‌وه‌ خاوێنتره‌ بۆ دڵی ئێوه‌و ئه‌وانیش.

دیاره‌ به‌ دابه‌زینی ئه‌م فه‌رمانه‌ ئیتر بۆ كه‌س نه‌بوو ژنه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ڕووبه‌ڕوو ببینێ. (ئایه‌ته‌كه‌ ته‌نها تایبه‌ته‌ به‌ خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ)، پاش ئه‌وه‌ی ئایه‌تی حیجاب بۆ خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر دابه‌زی، باوك‌و برای خێزانه‌كانی وتیان: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ئێمه‌ش له‌ پشت په‌رده‌وه‌ قسه‌یان له‌گه‌ڵ بكه‌ین؟ خوای گه‌وره‌ به‌م ئایه‌ته‌ وه‌ڵامی دانه‌وه‌ (لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاء إِخْوَانِهِنَّ..)[58] تا كۆتایی ئایه‌ته‌كه‌.

واته‌: تاوانیان له‌سه‌ر نییه‌ ئه‌گه‌ر په‌رده‌ نه‌كه‌ن له‌ ڕووی باوكیان‌و كوڕه‌كانیان‌و... هتد.

خوێنه‌ری به‌ڕێز بۆی ده‌رئه‌كه‌وێت كه‌ ئه‌م پرۆسه‌ی ژن هێنان‌و ژن ته‌ڵاقدانه‌ی زه‌ید‌و پاشان شوكردنه‌وه‌ی زه‌ینه‌ب به‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ چه‌ند ئامانجی گه‌وره‌ گه‌وره‌ی له‌ پشته‌وه‌ بوو، له‌لایه‌ك ئیسلام ویستی ڕێزی كۆیله‌ به‌رز بكاته‌وه‌ بۆیه‌ زه‌ینه‌بێكی بۆ ئه‌خوازێ كه‌ له‌ ئه‌شرافه‌و له‌لایه‌كیش پێویسته‌ باری ناجۆری (به‌كوڕ كردن) هه‌ڵئه‌وه‌شێته‌وه‌، بۆیه‌ ئه‌وان پێكه‌وه‌ نایانكرێ‌و ئه‌م ئه‌ركه‌ش به‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌بێ وه‌ك پێویست جێبه‌جێ نابێت بۆیه‌ خوای گه‌وره‌ له‌ ئاسمانه‌وه‌ لێی ماره‌ ئه‌كات.

---

[57] قال البخاري: حدثنا مسند عن يحى عن حميد عن أنس بن مالك قال: قال عمر بن الخطاب: يارسول الله ﷺ يدخل عليك البرو الفاجر، فلو أمرت أمهات المؤمنين بالحجاب؟ فانزل الله اية الحجاب. صحيح، أخرجه البخاري (٤٧٩٠).

[58] سورة (الأحزاب: ٥٥).

١٥- نووسه‌ر ئه‌ڵێت: "دابه‌زینی ئایه‌تی حیجاب بۆ سه‌ر ژنه‌كانی موحه‌ممه‌د بۆ گۆشه‌گیر كردنیان له‌ ماڵه‌وه‌و دوور خستنه‌وه‌یان له‌ هه‌موو چالاكییه‌ك بوو"[59].

له‌ وه‌ڵامدا ئه‌ڵێین: دابه‌زینی ئایه‌تی حیجاب له‌ نێوان خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و خه‌ڵكانی تری نامه‌حره‌مدا، گۆشه‌گیر كردن‌و دوورخستنه‌وه‌یان نه‌بوو له‌ مومارەسه‌ی كاری سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی‌و سه‌ربازی.... هتد. به‌ڵكو پاراستنیان بوو له‌ هه‌ر مه‌به‌ست‌و مه‌رامێكی خراپ كه‌ دوژمنانی دین هه‌میشه‌ له‌ كه‌میندا بوون بۆ له‌كه‌دار كردنی ئه‌و ماڵه‌ی كه‌ هه‌ڵگری په‌یامی خوایی‌و مه‌رجه‌عی موسڵمانان بوو، هه‌روه‌ك نووسه‌ر بێ ئاگاو نه‌زان له‌و بابه‌ته‌ی كه‌ نووسیویه‌تی به‌بێ ئه‌وه‌ی ئاماژه‌ به‌ هیچ سه‌رچاوه‌یه‌ك بكات و ئه‌ڵێت: په‌یامی حیجاب ژنه‌كانی موحه‌ممه‌دی به‌ زه‌ینه‌بیشه‌وه‌ گۆشه‌گیر كردو پێشگیری له‌ ناوزڕاندنی زیاتر كرد.

هه‌ی نه‌زان كامه‌یه‌ ئه‌و ناوزڕاندنه‌ی كه‌ ئاماژه‌ی پێ ده‌ده‌یت و له‌ چ كون و كه‌له‌به‌رێكدا شتێكی وه‌هات به‌رچاو كه‌وتووه‌ كه‌ بتوانی هۆكاری دابه‌زینی ئایه‌تی حیجابی بۆ بگێڕیته‌وه‌، پاشان ئه‌ی ئه‌و هه‌موو دان پێدانانه‌ی جه‌نابت چی لێ ئه‌كه‌یت سه‌باره‌ت به‌ به‌شداری كردنی خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ كاری سیاسی‌و سه‌ربازی‌و.. هتد.

نموونه‌شمان به‌شداری كردنی خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ غه‌زاكانداو ده‌ربڕینی ڕاو بۆچوونیان سه‌باره‌ت به‌ كاری موسڵمانان وه‌ك ئوم سه‌له‌مه‌ و ئاشتی نامه‌كه‌ی حوده‌یبیه‌و گێڕانه‌وه‌ی زیاتر له‌ سێ هه‌زار فه‌رمووده‌ له‌ زاری پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ و مامۆستایی كردنی موسڵمانان له‌ هه‌ر ڕاوبۆچوون‌و پرسیارێكدا كه‌ هه‌یانبوایه‌، هه‌روه‌ك له‌ ژیانی هه‌ریه‌كه‌ له‌ خێزانه‌ به‌ڕێزه‌كانیدا ئاماژه‌مان به‌و كارانه‌یان كردووه‌.. ئیتر نازانم گۆشه‌گیری خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌كوێدا ده‌بینرێته‌وه‌؟؟

٣- ڕه‌چاو كردنی ئادابی بیرنه‌كردنه‌وه‌ له‌ ماره‌كردنه‌وه‌ی خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ پاش خۆی (وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ

[59] لاپه‌ڕه‌ (١٢) كتێبی (كچانی خوا)

**كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيماً )[60]. واتە: بۆتان نییە ئازاری پێغەمبەری خوا بدەن‌و ژنەکانی پاش خۆی مارە بکەنەوە، کاری لەو جۆرانە لای خوا تاوانی گەورەیە.**

**کەواتە مارەکردنەوەی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پاش خۆی لەسەر ئیمانداران حەرام کرا، لەبەر ئەوەی هۆیەکە بۆ ئازاردانی پێغەمبەرو خێزانەکانی و دەبێت لە ژیان و مردنیدا ﷺ وەك دایك سەیر بکرێن‌و ڕێزی دایکایەتیان لێ بگیرێت.**

**عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: ئەم ئایەتە دەربارەی پیاوێك دابەزی کە نیازی خواستنەوەی یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەری کرد پاش لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ، (سوددی) دەڵێت: ئەو پیاوەی کە ئەو نیازەی کردبوو (تەڵحەی کوڕی عەبدوڵلا) بوو، خوا بەئاگا و بینەرو بیسەرە بە سەر نهێنی‌و ئاشکرای نیازو وتەکاندا، ئایەتی دابەزاندوکاری بەو شێوەیەی قەدەغە کرد، ئیبن عەباس دەڵێت: پاش دابەزینی ئەم ئایەتە تەڵحە بەندەیەکی ڕزگار کردو باری دە حوشتری بەخشی‌و هەروەها بەپێ چوو بۆ حەجی ماڵی خوا لە پەشیمانی ئەو نیازەی کە کردبووی.**

**کەواتە بە فەرمانی خوای گەورە زەینەب بوو بە دایکی ئیمانداران‌و هەمیشە شانازی بەو پرۆسەی هاوسەرگیرییەی دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەردا ﷺ بەوەی کە ئەوان خزم‌و کەس و کار مارەی کردوون لە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەلام ئەم خوای گەورەو پەروەردگار لە پشتی هەموو ئاسمانەکانەوە لە پێغەمبەری مارە بڕیوەو بۆی حەڵاڵ کردوە (زوجکن أهاليكن وزوجني الله من فوق عرشه)[61]. هەندێ جاریش ئەو باسەی لای پێغەمبەر ﷺ ئەکردەوە و ئەیووت: من بە سێ شت نازم هەیە بە سەرتا کە هیچکام لە خێزانەکانی ترت ئەو نازەیان نییە: باپیری من‌و باپیری تۆ یەکێکە، مارەکردنی من لە تۆ لە ئاسماندا بوو، جبریلیش نوێنەر و سەفیری بەجێ هێنانی**

---

[60] سورة (الأحزاب: ٥٣).

[61] انظر طبقات ابن سعد (٨/ ٧٣) الاستيعاب (٤/ ١٨٥١) الاصابة (٨/ ٩٣) .

**كاره‌كه‌ی من بوو[٦٢]. به‌و شێوه‌یه‌ هه‌میشه‌ له‌ لاوه‌ندنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوادا بوو تا زیاتر خۆشه‌ویستی خۆی بۆ ده‌ربڕی‌و زیاتر ماڵه‌كه‌ی بۆ بكاته‌ مایه‌ی حه‌وانه‌وه‌و ئارامی.**

**له‌ سه‌ره‌تادا وتمان خاتوو زه‌ینه‌ب ﷺ ئافره‌تێكی خاوه‌ن بنه‌ماڵه‌و ده‌وڵه‌مه‌ندو ده‌سه‌ڵاتدار بووه‌، له‌وه‌ ئه‌چێت یه‌كێك له‌و خواردنانه‌ی كه‌ هه‌میشه‌ خۆراكیان بوو هه‌نگوین بوو بێت، هه‌ركاتێك له‌ ماڵی باوكی گه‌ڕابێته‌وه‌ هه‌نگوینی له‌گه‌ڵ خۆی هێنابێت، یاخود هه‌ر له‌ لایه‌ن ماڵی باوكییه‌وه‌ بۆی هاتبێت، دیاره‌ ئه‌ویش به‌بێ پێغه‌مبه‌ری خوا نه‌یده‌خواردو تا ئه‌وه‌ بوو جارێكیان خاتوو عائیشه‌ وه‌ك غه‌ریزه‌یه‌كی به‌شه‌ری نیگه‌ران بوو كه‌وته‌ غیره‌كردن لێی‌و هه‌وڵی دا هه‌رچۆنێك بووه‌ له‌به‌ر چاوی بخات، هه‌روه‌ك له‌ فه‌رمووده‌كه‌دا ده‌رئه‌كه‌وێت كه‌: دایكمان عائیشه‌ بۆمان ئه‌گێڕێته‌وه‌ و ئه‌فه‌رموێ: جارێكیان پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ لای زه‌ینه‌ب هه‌نگوینی ئه‌خوارد و ماوه‌یه‌كی زیاد له‌لای مایه‌وه‌، هه‌ر بۆیه‌ من‌و حه‌فسه‌ ڕێك كه‌وتین له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ هاته‌ لای هه‌ر كامێكمان پێی بڵێین: ئه‌وه‌ مه‌غافیرت[٦٣]خواردووه‌؟ بۆنی مه‌غافیرت لێ ئه‌بیستم، وتی: نه‌خێر! به‌ڵكو هه‌نگوینم له‌لای زه‌ینه‌بی كچی جه‌حش خواردۆته‌وه‌، جارێكی تر ناگه‌ڕێمه‌وه‌ سه‌ری (واته‌: نایخۆمه‌وه‌)، سوێندم دا كه‌ به‌ كه‌س نه‌ڵێیت[٦٤].**

**له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی تردا هاتووه‌ كه‌ خاتوو سه‌وده‌ پێی فه‌رمووه‌: دیاره‌ ئه‌و هه‌نگه‌ی كه‌ ئه‌و هه‌نگوینه‌ی دروست كردووه‌ به‌ری ڕووه‌كی عه‌رفه‌تی خواردووه‌ كه‌ مغافیره‌..**

---

62 نقل ابن جرير، والبلاذري عن الشعبي، قال: كانت تقول زينب للنبي ﷺ اني لأول عليك بثلاث، مامن نساءك امرأة تدل بهن: ان جدى وجدك واحد واني انكحنيك الله من السماء، وكان جبريل عليه السلام السفير في أمري).

63 مغافير/ شله‌یه‌كی كه‌تیره‌یی شیرینی بۆن ناخۆشه‌و له‌ ڕووه‌كی عرفط دێته‌ خواره‌وه‌و هه‌نگ ده‌یخوات.

64 روي البخاري عن عائشة قالت: كان النبي ﷺ شرب عسلاً عند (زينب بنت جحش) ويمكث عندها فتوطأت أنا وحفصه على أيتنا دخل عليها فلتقل له: أكلت مغافير؟ إني أجد منك ريح مغافير، قال: ولكني كنت لست أشرب عسلاً عند زينب بنت جحش، فلن أعود له، وقد حلفت لا تخبري بذلك أحداً. أخرجه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري.

هەروەك چۆن خاتوو عائیشە ئەو مەغافیرە هەڵئەبژێرێ لەناو هەموو ڕووەك و گوڵێکی تردا، چونکە هەموویان ئەیانزانی هەنگ بە هۆی تامە شیرینەکەیەوە ئەیخوات، بەڵام بۆنەکەشی ناخۆشە، تا بە ناڕاستەوخۆ پێغەمبەریان تێگەیاند کە خواردنەوەی هەنگوینەکە کە لای زەینەب بوو باش نەبووە بۆت، تا خوای گەورە پەردە لەسەر نهێنییەکە هەڵدەداتەوەو ئایەتی (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).[٦٥] بەڵام هەندێکی تر هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەدەنە پاڵ خاتوو ماریەو خەوتنی لەگەڵ پێغەمبەردا لەماڵی خاتوو حەفسەو ئەمەش بووەتە هۆی نیگەرانی خاتوو حەفسەو پێغەمبەریش لە دڵنەوایی ئەودا ماریەی لە خۆی حەرام کردبێت. بۆچوون و ڕای یەکەم بەهێزترە کە خواردنەوەی هەنگوینەکە بووە لەسەر دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە، چونکە هەر لە سیاقی ئایەتەکەشدا وادەرئەکەوێ کە تەنها دوو کەس (تظاهرا) ئەو پیلانەیان گێڕا کە خاتوو عائیشەو خاتوو حەفسە بوو، هەروەك لە فەرموودەکەش خاتوو عائیشە ناوی هەردووکیانی هێناوە، لەڕاستیدا خاتوو زەینەب فەزڵی زۆری هەبووە، بەتایبەت خاوەنی باوەڕێکی پتەو و عیبادەتێکی زۆرو کارو کردەوەیەکی دروست بووە، هەروەك پێغەمبەرو هاوەڵان شایەتی چاکەی لەسەر دەدەن، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە عومەری کوڕی خەتاب: بەڕاستی زەینەبی کچی جەحش (أواهة[٦٦])یە، پیاوێك لەوێدا هاتە قسەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (اواه) مانای چی ئەگەیەنێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: واتە ڕازیو ملکەچ و تکاکار، هەر چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) پێغەمبەر خاوەنی میهرەبانیو ملکەچی خوای خۆیو هەمیشە دەستی تەوبەو پەشیمانی لە بەرزکردنەوەیدا بووە بەرانبەر دەرگاو بارەگای خوایی[٦٧].

---

[65] (التحريم: ١).

[66] ( اواه): بە کەسێك ئەوترێ لە خۆشەویستی خوادا برژابێت .

[67] أخرج أبو عمر بن عبد البر في الاستيعاب عن حجاج بن منهال، حدثنا عبدالحميد بن بهرام، عن شهر بن حوشب، عن عبدالله بن شداد أن رسول الله ﷺ قال لعمر بن خطاب (ان زينب بنت جحش (أواهة) فقال رجل: يارسول الله ماالأواه؟ قال: الخاشع المتضرع وان ابراهيم لحليم أواه منيب). الاستيعاب، (٤/ ١٨٥٢).

کەواتە ئەو وەسفو سەنایەی کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خاتوو زەینەب کردی لە سنورێکدا بوو کە هاوشانی کرد لەگەڵ باوکی هەموو پێغەمبەراندا ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێبێت) بەڕاستی جوانترین وەسف بوو کە شایان بێت بە ئافرەتێك کە خوای گەورە هەڵی بژاردبێت بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کۆمەڵێك دەستوورو ئادابی ئیسلامی، هەروەها دایکمان عائیشە رضي الله عنها لە کاتی لە دونیا دەرچوون و مردنی خاتوو زەینەبدا ئەفەرموێ: بەڕاستی لەدونیا دەرچوو ئەو تاکە کەسەی کە سوودمەند بوو بۆ منداڵانی بێ باوك و ژنانی بێوەژن، کە بەدەستی خۆی پێستەی خۆشە دەکردو بە پارەکەی خزمەتی خەڵکی بێ نەواو هەژاری پێدەکرد لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا[٦٨].

ئەم ئافرەتە بەڕێزە هەمیشە ویستی وابووە کە ماندوو بێ و بە ئارەقی نێوچەوانی خۆی یارمەتی هەژاران بدات. نموونە: لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا، هەروەك خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ موچەی لە (بيت المال) بۆ بڕابوویەوە، بەڵام تەنها یەك درهەمی بەکار نەدەهێنا بۆ ژیانی خۆی، بەڵکو هەر هەمووی ئەبەخشی، تەنانەت جارێکیان دەستەکانی بەرز کردەوەو داوای لە خوا کرد کە جارێکی تر ئەم پارەی (بيت المال) نەبێتە نسیبم ئەوە بوو هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کرد[٦٩].

سەبارەت بەو دەست گوشادیو خێرخوازییەشی کە هەیبووە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ سەلمێنەرییەتی کە ئەفەرموێ بە خێزانەکانی (أسرعكن لحاقاً بي أطولكن يداً...) واتە: (خێراترین کەسێك کە بە من بگات، دەست کراوەترینتانە...). دایکمان عائیشە رضي الله عنها ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أسرعكن لحاقاً بي أطولكن يداً...). پاشان فەرمووی: ئێمەش هەموومان دەستمان کردەوەو پێشبڕکێمان ئەکرد لە خێرا، بۆمان دەرکەوت دەستەکانی زەینەب لە ئێمە کراوەتر بوو، لەبەر ئەوەی ئەو بە

68 عن عائشه (رضي الله عنه) قالت: لقد ذهبت حميدة مفيدة، فمزع اليتامى ولأرامل، كانت (رضي الله عنه) صناع اليدين، تدبغ وتخرز، وتتصدق به في سبيل الله عز وجل . ابن سعد (٨/ ١١٠).

69 حفه الصفوة (٢/ ٤٨) .

دەستەكانی كاری دەكردو بەردەوام دەیبەخشی[70]، زەینەب جگە لە موچەی (بیت المال) كاری وەك هەموو دایكانی موسڵمان ئیشی دەستیشی ئەكردو لەوەش هەر دەیبەخشی و پێشی هەموویانی دابوویەوە، بەڵام لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە (دایكمان عائیشە ئەفەرموێ: لە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ هەر هەموومان دانیشتین و دەستمان گرت بە قەدەر یەك كەچی كەسمان جیاوازییەكی ئەوتۆمان نەبوو، تا كاتێ خاتوو زەینەب كۆچی دوایی كرد، ئەو كاتە زانیمان كە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی درێژی دەستەكە نەبووە، بەڵكو دەست كراوەیی و درێژی لە خێر و سەدەقەیە[71].

بەر لە مردنیشی هەندێ وەسیەتی كرد كە پاش مردنی لەسەر جێگەكەی پێغەمبەر ﷺ بیبەن بۆ گۆڕستان و كەژاوەیەك بدەن بەسەریدا، پاشان فەرمووی: خۆم كفنێكم بۆ خۆم ئامادە كردووە، ئەگەر گەورەی موسڵمانان عومەری كوڕی خەتاب كفنی بۆ ناردم، دانەیەكیان بكەن بەخێر بۆم، هەر مافێكیشم هەبوو پاش خۆم هەر بیكەن بە خێر، جا بەڕێزان سەرنج بدەن لەم خاتوونە بەڕێزە كە ئەوەندە خێرخواز بووە لە كاتی سەرەمەرگیشدا هەر لە یادی نەكردووەو دەستبەرداری نەبووە..

لە كاتی نەخۆشی و سەرەمەرگیشدا خێزانەكانی تری پێغەمبەر ﷺ خزمەتیان دەكردو بە دەوریدا دەهاتن، هەروەها ئەسمای كچی عومەیس كە خوشكی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو كەژاوەكەی بۆ دروست كردو ئیمامی عومەریش زۆر پێی باش بووە، چونكە تەرمی پیرۆزی دایكمان زەینەبی سەرتاپا داپۆشیبوو..

من في السماء كزينب أهواهة ولها اليد الطولي لدى الأعطاء

كانت صناعاً تبتغي بصنيعها وجه الذي يجزي أجلّ جزاء

---

70 عن عائشة أم المؤمنين قالت: قال رسول الله ﷺ (أسرعكن لحاقاً بي أطولكن يداً) قالت: تيطاولن ايتهنَّ أطول يداً، قالت فكن يتطاولن أيتهن اطول يداً قالت: فكانت أطولنا يداً زينب، لأنها كانت تعمل بيدها وتصدق)، مسلم برقم (١٠١/ ٢٤٥٢).

71 اخرجه ابن سعد في الطبقات (١٠٨/٨) ولحاكم في المستدرك (٢٥/٤) وصحيحه ووافقه الذهبي.

## چوارهەم: بەدەستهێنانی پشتگیری و پشتیوانی (كسب التأييد):

ئامانجێکی تری فرەژنی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە پێکەوەنانی زۆرترین پشتیوان بۆ ئەم دینە.. پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بە هۆی کاری ژن‌و ژنخوازییەوە زۆربەی هۆز و تیرەکان لە خۆی نزیك بکاتەوەو سۆزو خۆشەویستییان بەلای خۆیدا رابکێشێت، بۆ ئەوەی بتوانێت لەو رێگایەوە ئەو پەیامەی کە لە ئەستۆیدایە بیگەیەنێتە هەموو تیرە و هۆزەکانی قورەیش و تەواوی دورگەی عەرەبی بە حوکمی ئەوەی کە قورەیش سەرداری هەموو عەرەبەکان بووە، کە ئەگەر قورەیشییەکان موسڵمان بن ئەوا زۆرینەی عەرەبی ناوچەکە موسڵمان دەبن، نموونەشمان بۆ ئەم کارە پڕ لە حیکمەت و بەرەکەتەی کە پێی هەڵساو زۆرینەی مەرامی بەو پڕۆسەی هاوسەرگیرییە هێنایە دی:

## ١ـ جوەیرییەی کچی حارس (رەزای خوایان لێبێت)[٧٢]:

ناوی جوەیرییەی کچی حارسی کوڕی زراری کوڕی حەبیبی کوڕی عائزی کوڕی مالیکی کوڕی جوزەیمەی کوڕی موستەلەق کە لە هۆزی خوزاعەیە.

ئەم ئافرەتە بەڕێزە یەکێکە لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێ: (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ) (الأنبياء: ١٠١).

واتە: بێگومان کەسانێك لەپێشدا لە لایەن ئێمەوە بە هۆی کار و کردەوە و چاکەکانیانەوە بەڵێنی پاشەڕۆژی چاکتریان پێ درابوو، ئەوانە لەو ئاگرە بە دوور دەگیرێن، گەرما و ناڕەحەتیش ناچێژن.

ئەم ئافرەتە بەڕێزە لە خانەوادەیەکی بێباوەڕی ستەمکار بوو، ئەم خانەوادەیە تا سەر ئێسقان دژایەتی پێغەمبەر و موسڵمانانیان دەکرد و چەندین جار بە شەڕ و پێکدادان ڕووبەڕوویان بوونەتەوە، تا جارێك لەو جارانە لە غەزای (مورەیسیعدا) هۆزی بەنی

[72] نساء حول الرسول، تعبم محمد مهدي الاستنبولي و مصطفى أبو الشبلي.

موستەلەق شکستیان هێنا و کۆمەڵێکی زۆر لە ئافرەتان و شتو مەکیان بە غەنیمە دەست موسڵمانان کەوت و هێنایانەوە بۆ مەدینە، ئەم ئافرەتەش (جوەیریە) یەکێك بوو لەو سەد ئافرەتەی کە بە دیل گیرابوون. دیارە کەسانێکیش کە دیل بن بە خاوەنی خۆیان نامێنن و دەست کرا بە دابەش کردنیان و قورئەکێش بۆ هەر یەکەیان تا بزانن بەر کێ دەکەون و هەریەکەیان کێ دەبێتە خاوەنیان؟ ئەوەبوو لەو قورئەکێشییەدا جوەیرییە بەر سابیتی کوڕی قەیس دەکەوێت، سابیتیش دەڵێ هەر کەسێ لێم بکڕێتەوە بە نۆ ئۆقیە ئاڵتوون دەیفرۆشمەوە، جوەیرییەش ئەم هەلە ئەقۆزێتەوە تا خۆی ئازاد بکات و بتوانێ ئەم ئاڵتونە پەیدا بکات بە شێوەی یارمەتی لە لایەن خەڵکەوە، هەر بۆیە یەکەم جار ڕووی لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ناو بەرەو ژوورەکەی خاتوو عائیشە ڕۆیشت کە پێغەمبەری لێ بوو، داوای لێدەکات کە بەڵکو حەقەکەی بۆ بدەن و ڕزگاری بکەن و دەڵێ: من جوەیرییەی کچی حارسم کە سەرۆك عەشیرەتی هۆزەکەیە، پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی بە هەلزانی بۆ ئەوەی بتوانێ لەو ڕێگەیەوە دەروونی خزم و کەس و کارەکانی کەمەندکێش بکات بەرەو لای ئیسلام و دەفەرموێت: ئایا لەو داوایەی دەیکەیت باشتر ناوێ؟ ئەویش دەڵێ: ئەو شتە باشە چییە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خۆم حەقەکەت بۆ دەدەم و مارەشت دەکەم لە خۆم.. ئەویش دەڵێ: زۆرم پێ باشەو خۆشحاڵ دەبم.. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ پەیمانەکەی خۆی بردە سەر و جوەیرییەی کردە خێزانی خۆی و دایکی ئیمانداران.

پاشان دەنگو باس بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەر ﷺ نیکاحی جوەیرییەی خستۆتە سەر خۆی، بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر هەر ئافرەتێکی ئەو هۆزەیان لە لابوو دەسبەجێ ئازادیان کردن و مارەیان کردن لەخۆیان و پاشان وەك ئافرەتە ئازادەکانی لای خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن.. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە هۆزی بەنی موستەلەق زۆر سەریان سوڕما لەو کارە پیرۆزەی پێغەمبەر و هاوەڵانی، گەلێك دڵخۆش بوون بەو نرخ و ڕێزە کە دەرهەقیان کراوە و ڕێز لە نەسەبو حورمەتیان گیراوە لە کاتێکدا ئەمان شەڕیان پێ فرۆشتوون و خەڵکیان لێ شەهید کردوون، ئیتر پاش ئەم هەنگاوە گرنگە

هەر هەموو هۆزەکە (ئەوانەی کە مابوون) باوەڕیان هێناو شوێن پێغەمبەر و پەیامەکەی کەوتن.

هەروەها دایکمان عائیشە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: بەڕاستی نەم بینی بە وێنەی جوەیرییە ئەوەندە پیرۆز و بەرەکەتدار بێت بۆ هۆزەکەی و خوای گەورە کردیە وەسیلەی هیدایەت[٧٣].

بەم شێوەیە ئەم ئافرەتە پڕ خێرو بەرەکەتە بوو بە دایکی ئیمانداران و هاوسەر و هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، هاوکات لە خزمەتی پێغەمبەردا شارەزاییەکی تەواوی وەرگرت لە بارەی (تەفسیر و فیقە و فەرموودە و... هتد). بوو بە مامۆستایەکی شارەزا بۆ ئافرەتانی دەوروبەری. ئەم دایکە بەڕێزە ژیا تا ساڵی پەنجای کۆچی و لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا کۆچی دوایی کردو مەروانی کوڕی حەکەم کە والی مەدینە بوو نوێژی مردووی بە سەرەوە کرد. تەمەنی نزیکەی حەفتا ساڵی خایاند.

## ٢ـ سەفیەی کچی حوییەی کچی ئەختەب رضي الله عنها

سەفیە کچی سەرۆك عەشیرەتی بەنی قورەیزە بوو، کە یەکێك بوو لە سەرۆك عەشیرەتەکانی جوولەکە، کە ئەوپەڕی هەڵوێستی دوژمنکارانەی بەکار دەهێنا بەرانبەر بە پێغەمبەرو پەیامەکەی، لەولاشەوە خێزانی کینانەی ئەبی حەقیق بوو، پیاوێکی شاعیر بوو، شەڕێکی گەورەی بەرپا کردو غەزای خەیبەری لێ کەوتەوە، بەهەر حاڵ موسڵمانەکان سەرکەوتنێکی پڕ لە خێرو بەرەکەتیان بەدەست هێنا، بەڵام باوك‌و براو مێردو زۆرینەی خزمەکانی سەفیە لەو غەزایەدا کوژران و خۆشی یەکێك بوو لەو دەسکەوتە زۆرە لە ژمارە نەهاتووەی کە دەست پێغەمبەرو موسڵمانەکان کەوت، پاش ئەوەی کە دەست ئەخەنە ناو غەنیمەکە، هەروەك وەحشی کوڕی حەرب ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە هاوەڵەکانی: چی ئەڵێن دەربارەی ئەم ئافرەتە کە کچی سەرۆك عەشیرەتی جوولەکەکانی بەنی قورەیزەیە،

73 تقول عائشه أم المؤمنين رضي الله عنها: فلقد اعتق يتزوجه اياها مائة أهل بيت من بني المسطلق، فما أعلم امرأة اعظم بركة على قومها منها، حياة محمد لمحمد حسنين هكين ص١٠٠.

**ئەوانیش بەیەك دەنگ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە هەموومان شایانتری بۆی.. ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕزگاری کرد و مارەی کرد لە خۆی بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو جێگەو ڕێگەیەی بۆ بکاتەوە کە لە دەستی دابوو..**

**هەرچەندە صەفیە خۆیشی خەوێکی بینی لە شەوی بوکێنیدا کە گوێزرابویەوە بۆ کینانەی کوڕی ڕەبیع ئەبینێ خۆر کەوتۆتە سنگییەوە و پاشان خەوەکەی گێڕاوەتەوە بۆ مێردەکەی و ئەویش زللەیەکی لێدەداو پێی وتووە خوازیاری پاشای مەدینە ئەکەیت؟ کەپاش ئەوەی ئەبێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ جێگەی زلەکەی هەر پێوە ئەبێت، ئەوە بوو خەوەکە هاتە دی و ڕۆژی دوایی خەیبەر ڕزگار کراو ئەمیش بوو بە خاوەنی پێغەمبەر ﷺ.**[74]

**پاشان صەفیە بووە خێزانی پێغەمبەر و دایکی ئیمانداران ئەڵێت: کەس نەبوو لە دنیا ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ جێگای کینەو بێزاری من بێت، بەڵام گەورەیی و ڕەوشتبەرزی پێغەمبەر وای لێم کرد کە ببێتە خۆشەویسترین کەس لە دڵمدا، بەوەی کە هەمیشە داوای لێبوردنی دەکردو دەیفەرموو: تۆ ئەزانی باوکت و قەومەکەت چی و چییان بەسەر من هێنا و چییان کرد و چیان ئەووت، تا وام لێهات هیچ شتێك لە دڵمدا نەما بەرانبەری**[٧٥]**.**

**پێغەمبەر ﷺ زۆر ڕێزی لێ دەگرت، هەمیشە مایەی دڵنەوایی و پشتیوانی بوو بۆی، بۆ نموونە: صەفیە رضي الله عنها ئەڵێت: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەکەم و منیش قسەیەکم لە عائیشە و حەفسەوە پێگەیشتبوو کە وتبویان: ئێمە بەڕێزترین لە لای پێغەمبەر لەو ئافرەتە جولەکەیە بۆم گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی بۆ نەتووت پێیان: کە بۆچی ئێوە لە من باشترن کە من مێردەکەم موحەممەد و باوکم**

---

[74] الطبراني في الكبير (٢٤/ ٦٧)، (٢٤/ ٧٣)

[75] روای ابویعلی عن أم المؤمنين صفية بنت حي رضي الله عنها قالت: انتهيت الى رسول الله ﷺ ومامن الناس أحد اكره الي منه، فقال: (ان قومك صفوا كذا وكذا) قالت: قمت من مقعدي وما من الناس أحد أجب الي منه). ابو يعلى برقم (٧٠٧٨).

**هارونە و مامیشم عیسایە[٧٦]!! پاشان سەرزەنشتی حەفسەی كرد و فەرمووی (حەفسە لە خوا بترسە).**

**حیكمەت و دانایی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەكانیدا بە شێوەیەك بوو كە بواری هیچ یەكێك لە خێزانەكانی نەدەدا بە بریندار كردنی هەست و شعوری یەكتری، بە شێوازێك لۆمە و سەرزەنشتی دەكردن كە جارێكی تر بیر لە ئازاردانی یەكتر نەكەنەوە..**

**دایكمان صەفیە (خوا لێی ڕازی بێت) خاوەنی دوو سیفەتی گەورە بوو، كە سیفەتی میهرەبانی و لێبوردەییە بە تایبەت بەرانبەر كەسانێك كە خراپەیان بەرانبەر بكردایە و ئەم ئایەتە پیرۆزە بە تەواوی لە هەڵسو كەوتیدا ڕەنگی دابوویەوە (وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[٧٧]. ئەگێڕنەوە كە كەنیزەكێكی هەبوو، ئەم كەنیزەكە ئەچێتە لای گەورەی موسڵمانان عومەری كوڕی خەتتاب و شكاتی سەفیەی لەلا كردووە، تاوانباریشی كرد بەوەی كە دایكی ئیمانداران ڕۆژانی شەممەی خۆش دەوێت، تاوانباریشی كرد بەوەی كە هەر خۆشەویستی بۆ جوولەكەكان هەیە و هەمیشە سەردانیان دەكات، پاشان ئیمامی عومەریش ناردیە لای و ئەم پرسیارانەی لێكرد.. سەفیەش فەرمووی: شەممەم خۆش ناوێت لەو كاتەوە خوای گەورە گۆڕیویەتی بە هەینی بۆم، مەبەست پێی موسڵمان بوونیەتی، سەبارەت بە جولەكەكانیش خزم و كەس‌وكارم هەیەو سەردانیان دەكەم، پاشان ڕووی كردە كەنیزەكەكەو پێی فەرموو: چی وای لێ كردی ئەم كارە بكەیت؟ ئەویش وتی: شەیتان! سەفیەش فەرمووی: دەبڕۆ وا ئازادم كردی[٧٨]، كەواتە لەم ڕووداوە بۆمان دەرئەكەوێت كە چۆن ڕەنگدانەوەی ئایەتەكانی پێوە دیار بوو، ڕق و كینەی خۆی خواردەوەو توڕەیی و تۆڵەلێسەندنەوەی بە لێخۆش بوون و ئازاد كردنی وەڵام دایەوە.**

76 الحاكم (٢٩/٤). والترمذي (٣٧٢٨) – (٣٧٢٩).

77 آل عمران الآية (١٣٤).

78 الاستيعاب (ص ٩٠٠) باب: الصاد.

ئەم خاتوونە بەڕێزە هەمیشە پەیوەست بووە بە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەتایبەت ئەو فەرموودانەی کە لە بواری زانستو زانیاریدا فەرمووبووی، وەك (طلب العلم فريضة على كل مسلم وسلمة) و (من يرد اللّه به خيراً يفقه في الدين). جا بەهرەمەند بوونی لەم بوارەدا و لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وای لێکردبوو کە هەر بەخۆیەوە نەوەستێ، بەڵکو هەمیشە وەك مامۆستایەك ئافرەتانی کۆ دەکردەوەو لە ژورەکەیدا قورئانیان دەخوێند و ئامۆژگاری دەکردن کە بۆچی لەم کاتانەدا گریان و فرمێسکتان نییە، خۆ ئەگەر ملکەچی و لەخوا ترسان هاوەڵی قورئان خوێندنەکەتان بێت ئەوا گریانیشتان دەبێت، هەروەها ئەم دایکە میهرەبانە لە کاتی ئابلۆقەکەی ماڵی ئیمامی عوسماندا (رەزای خوایان لێ بێت) ڕۆڵی جوامیری و وەفاو مەردانەی بینی کە بەردەوام نان و ئاوی ئەگەیاندە ئیمامی عوسمان تا ئەو کاتەی کە شەهیدیان کرد.

بەم شێوەیە توانی ژیانێکی پڕ لە باوەڕ و خزمەت بە موسڵمانانی بباتە سەر تا تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵی و لە سەردەمی موعاویەدا کۆچی دوای کرد و هەر لە مەدینە و لە بەقیع وەك خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ تەرمی پیرۆزیان بەخاك سپارد.

## ٣ـ مەیمونەی کچی حارسی هیلالی (رەزای خوای لێبێت)

مەیمونە یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کە خاوەنی شەرەفو بنەماڵەیەکی بەرز بوو. ژنخوشکی عەباسی مامی پێغەمبەر بوو ﷺ و پووری هەر دوو کەڵە پیاوی ئەم ئیسلامە عەبدوڵلای کوڕی عەباس و خالیدی کوڕی وەلید بوو (رەزای خوایان لێ بێ).

سەرەتا خێزانی مەسعودی کوڕی عەمری سەقەفی بوو، ئەم ئافرەتە بە هۆی زۆر تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ماڵی ئوم فەزڵی خوشکی کە خێزانی عەباسی مامی پێغەمبەر بوو ﷺ هەندێك شارەزایی پەیدا کردبوو دەربارەی ئیسلام و شیعارە دینییەکان و هەواڵی موسڵمانە کۆچکردوەکان و غەزاکانی بەدر و ئوحود، بێگومان گوێبیستی ئەو هەواڵو قسەو باسانە جێگەیەکی لە دڵی مەیمونە داگیر کردبوو.

لە کاتێکدا کە هەواڵی سەرکەوتنی پێغەمبەر و موسڵمانەکان بەسەر جوولەکەکانی خەیبەردا گەیشتە مەککە، ئەم لە ماڵی ئوم فەزڵی خوشکی بوو، بە گەیشتنی هەواڵەکە خۆشی و کامەرانییەکی بێ سنووری لە ماڵی ئوم فەزڵدا دروست کردو مەیمونەش هاوەڵ و هاودەمی ئەو خۆشییە بوو، پاشان گەڕایەوە ماڵەوەو بینی وا مێردەکەی غەمبار و دڵتەنگ کەوتووە بەبیستنی ئەو هەواڵە، دیارە ئەم حاڵە بووە هۆی دەنگە دەنگ و قسەی ساردکردن بەرانبەر یەکتر، تا وەزعەکە وای لێهات کە مەیمونە ناچار بکات لە بەجێهێلانی ماڵەکەی و بچێتەوە ماڵی ئوم فەزڵی خوشکی و بە یەکجاری بمێنێتەوە.

ڕۆژگار هات و چوو، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانەکان گەڕانەوە مەککە بە یەکێك لە بەندەکانی پەیمانی حودەیبیە کە سێ ڕۆژ لە مەککەدا بمێنێتەوە و تەوافی ماڵی خوا بکەن و قوربانی سەربڕن.. ئەوە بوو هێز و دەسەڵاتی موسڵمانەکان و بەرز بوونەوەی هیتاف کێشان بە (لبیك اللهم لبیك، لبیك لاشریك لك لبیك)، خۆشیی خستە دڵی ئەو موسڵمانانەی کە لەبەر هەندێ ئیعتبار باوەڕەکەیان شاردبویەوە لە بێباوەڕانی مەککە. مەیمونەش یەکێك بوو لەوانەو ئیتر خۆی پێ نەگیراو باوەڕەکەی ئاشکرا کرد و وتی بە ئوم فەزڵی خوشکی: ئەمەوێت خۆم پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ بکەم، ئەویش قسەی مەیمونەی گەیاندە عەباسی مێردی و پاشان عەباس چووە خزمەتی پێغەمبەر و هەواڵەکەی پێگەیان، ئەویش دەستبەجێ قبوڵی کرد و نکاحی خستە سەر خۆی و چوار سەد درهەمی کردە مارەیی بۆی.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە ئەم ئایەتە (وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ) (الأحزاب: ٥٠) لەسەر مەیمونەو ئەو هەڵوێستەی دابەزیوەتە پێغەمبەر ﷺ[79].

بوونی مەیمونە بە خێزانی پێغەمبەر و دایکی ئیمانداران کۆتایی بە ژنهێنانی پێغەمبەر هێنا، واتە کۆتا خێزانی بووە، لە مانگی شەوالی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا

[79] انظر سيرة ابن هشام (٢٩٦/٤)، والأصابة (١٩٢/٨)، والأستيعاب (١٩١٦/٤)، والطبقات لأبن سعد (١٣٧/٨) والأية رقم (١١٥) من سورة الأحزاب.

بوو، مەیمونە لە هەموو خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ کەمتر لەگەڵ هاوسەری خۆشەویستیدا ژیاو پاش ماوەیەکی کەم پێغەمبەر ﷺماڵئاوایی لە ژیانی دونیا کرد، هەرچەندە دایکمان مەیمونە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ساڵانێکی زۆر ژیا تا تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵو لە ساڵی شەست و یەکی کۆچی گیانی پاکی بە پەروەردگاری ئەسپێرێ و لەو جێگایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێزاوێتییەوە بە خاك ئەسپێرێ لەسەر وەسیەتی خۆی (ڕەزای خوای لێ بێت).

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) پاش مردنەکەی دەربارەی ئەفەرمووێ: (ذهبت والله میمونة أما أنها كانت من اتقانا الله وأوصلنا للرحيم).[80]

واتە سوێند بەخوا مەیمونە کۆچی دوای کرد کە لە هەموومان زیاتر لە خواترس بوو، لە هەموومان زیاتر سیلەی ڕەحمی بەجێ دەهێنا..

## پێنجەم: بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری:

ئامانجێکی تری گەورەی فرەژنی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە پەروەردەکردنی ئەو ژنانە تا ببنە مامۆستای ئایینی و ڕێبەری سیاسیی لەناو ئافرەتاندا، گومان لەوەدا نییە کە نیوەی کۆمەڵگا بریتییە لە چین و توێژی ئافرەتان و ئەمانیش هەر وەك پیاوان پێویستییان بە فێربوون و خۆ ڕۆشنبیر کردن هەیە، بەتایبەت لەو کارانەی کە پەیوەندە پێیانەوە، وەك مەسائیلی ژنو مێردایەتی و سووڕی مانگانە و زەیستانی و.... هتد، جا ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەندێ جار شەرمیان دەکرد لەو جۆرە پرسیارانەدا ڕووبەڕووی پێغەمبەر ببنەوە، یا پێغەمبەر ﷺ شەفافانە شتەکەی پێ نەئەگەیاندن کە بە تەواوی تێبگەن، بۆ نموونە:

موسلیم و بوخاری لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە کە ئافرەتێکی مەدینەیی پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی خۆشۆردنی پاك بوونەوەی لە خوێنی بێ نوێژی؟ پێغەمبەریش فەرمانی پێ کرد بە خۆشتن، پاشان فەرمووی: بە پارچەیەك لۆکەی بۆن خۆشکراو پاکی بکەرەوە. ئینجا ئافرەتەکە وتی: چۆن پاکی بکەمەوە؟ فەرمووی: "پاکی بکەرەوە پێی"، وتی: چۆن؟ فەرمووی: سبحان الله خۆتی پێ پاك بکەرەوە،

[80] اخرجه ابن سعد (٨/٦٣٨) والحاكم (٤/٣٢) وكلاهما من طريق يزيد بن الأصم.

عائیشە وتی: ڕامکێشایە لای خۆم و پێم وت: بیهێنە بە شوێن و پاشماوەی خوێنەکەدا.

پێغەمبەر ﷺ شەرمی کرد لەوەی کە بە ڕوونی پێی بڵێت ئەو لۆکەیە بخاتە شوێن هاتنی خوێنەکە تا تەواو پاك ببێتەوە، ئەوە بوو خاتوو عائیشە تێی گەیاند و فێری کرد کە چۆن و چی بکات.

دیارە ئەم کارە گرنگانە و فێرکردن و ڕۆشنبیر کردنی کچان و ژنانی ئەو کۆمەڵگایە بە تەنها یەك ئافرەت نەئەچوو بەڕێوە، بەڵکو پێویستی بە کۆمەڵێك لە ئافرەتان هەبوو کە بتوانن بەکاری خۆیان هەستن و ڕۆڵی مامۆستا و ڕۆشنبیرێك ببینین، تا تەواوی ئافرەتانی کۆمەڵگاکە هۆشیار بکەنەوە، نەك هەر لە مەسائیلی بێ نوێژی و پاکێتی و... هتد، بەڵکو هەموو لایەنەکانی پەرستش و مامەڵە و هەڵسوکەوت و ڕەوشت، کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ باشترین گەیەنەر و ڕێ پیشاندەر بوون لە پێغەمبەرەوە، هەروەها پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ چاکترین مەرجەع بوون لە فەتوا و گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر و چارەسەری کێشەکان.

کەواتە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی فرەژنی لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بڵاوکردنەوەی زانیاری بوو لەناو توێژەکانی ژناندا. نەك ئارەزوو و هەوەسبازی.. ئەم پێنج خاڵە بە کورتی بریتی بوون لە فەلسەفەی فرەژنی پێغەمبەر ﷺ کە ئەگەر لەبەر درێژ بوونەوەی باسەکە نەبوایە ئەبوو زیاتر لەسەری بڕۆشتینایە و بۆ نووسەر و وەرگێڕ و خوێنەرانی بەڕێزیشمان زیاتر ڕۆشن بکردایەتەوە کە ئەو ژن هێنانانەی پێغەمبەر ﷺ زۆر لە ئامانجی هەوەسبازی و شتی دونیاییەوە دوور بووە و پڕ بووە لە هۆکاری دینی و ئینسانی.

١٦- نووسەر ئەڵێت: "حەدیسێکی تر باسی ڕووداوێك ئەکات کە موحەممەد لەگەڵ هەندێك لە ژنەکانی کێشەیان لەسەر خەرجیی ماڵ دەبێت، لەو کاتەدا ئەفسەری کەللەڕەق و پایەبەرزی موحەممەد عومەری باوکی حەفسە خۆی دەکات بە ژووردا، ژنەکان لەبەر مەزاج تورەیی بێدەنگ دەبن و دوور دەکەونەوە، عومەریش هاواری لێ

بەرز دەبێتەوە و دەڵێت: ئەمە شەرمەزارییە کە ڕێزی زیاتر لە من دەگرن تا پێغەمبەری خوا".

لە وەڵامدا ئەڵێین: یەکەم سەبارەت بەو مەجلیسە کە نووسەر ئاماژەی پێدەکات زۆر دوورە لە ڕاستییەوە و بوختان هەڵدەبەستێت و لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ مەجلیسی بەو شێوەیە هەرگیز نەبووە، کە ڕێزی پێغەمبەری تێدا بەکەم گیرابێت لە هاوەڵانی (حاشا لله)، بەڵکو دانیشتنیان لە خزمەت پێغەمبەردا ئەوپەڕی بە ملکەچی و گوێڕایەڵیو ئارامییان بەخەرجداوە ئەو ئەفسەرە پایەبەرزە لە خزمەت پێغەمبەردا ئەوەندە دەنگی بەرز نەکردۆتەوە کە بەیەك جار لە قسەکانی حاڵی بین، نەك ئەو هاوار و دەنگ بەرز کردنەوەیەی کە نووسەر نەزان و دەیداتە پاڵی و بەنیازی پیسی خۆی لە شەئن و شکۆی پێغەمبەری ﷺ پێ کەم بکاتەوە، ڕاستی ڕووداو و مەجلیسەکەش بەم شێوەیە بوو کە (... فقال عمر رضي الله عنه لأكلمنَّ النبـي لعله يضحك، فقال عمر: يارسول الله لو رأيت بنت زيد ـ امرأة عمرـ فَسألتني النفقة آنفاً فوجأت عنقها، فضحك النبـي حتى بدا نواجذه، قال هنَّ حولي كما نرى يسألني النفقة".

جا لەبەر درێژی فەرموودەکە ئەو باسەی ئیمامی عومەر ئەهێنین کە هاتە ژوورەوە و پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ دانیشتبوو، خێزانەکانیشی لە دووری بوون، عومەر رضي الله عنه فەرمووی: ئێستا قسەیەك ئەکەم بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو بیخەمە پێکەنین، فەرمووی: ئەی پێغەمبەر ئەگەر کچەکەی زەید واتە ژنەکەی عومەر خۆی، داوای بژێویم لێ بکات و لە ملی بدەم بەلاتەوە چۆنە؟ پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە پێکەنی تا دانی پیرۆزی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: ئەمانەی چواردەوری منیش هەموویان داوای بژێوی و خەرجیم لێ دەکەن..

ئیتر نازانم نووسەر چۆن ڕێگەی بە خۆیدا ئەو درۆ شاخدارە بکات و خیانەت لە خامەکەی بکات.

دووەم: سەبارەت بەو کێشەیەی کە نووسەر ئاماژەی پێدەکات ئەویش ئەوەیە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ داوای خۆشگوزەرانی زیاتریان لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، دەڵێین نە پێغەمبەری خوا ﷺ مەلائیکە بووە و نە خێزانەکانیشی، لەبەر ئەوە

**ناتوانین دایان بڕنین لەو سیفەتانەی کە لە خودی مرۆڤەکاندا هەیە، چونکە ئەوانیش مرۆڤن، لەبەر ئەوە هەموو خێزانێك چاوەڕێی ڕوودانی کێشەی لێ دەکرێت بە هۆی ئەو جیاوازییە سروشتییەی کە لە بیروبۆچوونی مرۆڤەکاندا هەیە، هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەکەش بەم شێوەیە بوو کە پێغەمبەر ﷺ ژیانێکی بژی و نەمری بۆ خۆی و خێزانەکانی هەڵبژاردبوو، لەکاتێکدا دەیتوانی ژیانیان چاك بکات و ڕازییان بکات، بەڵام هەر بەهۆی ئیرادەی بەرزییەوە ئەیویست زاڵ ببێت بە سەر هەواو ئارەزووە دەروونییەکاندا بۆ ئەوەی سەرقاڵی ژیانی دونیا نەبن و کەمتەرخەمی بکەن بەرانبەر بە گرنگترین ئەرکی سەرشانیان کە گەیاندنی پەیامی خوایی بوو بە خەڵکی، بەڵام هاوکات لە دەروونی خێزانەکانیدا وەك ویست و ئارەزووی هەموو ئافرەتێك خۆشویستنی ژیانی دونیا و خۆشگوزەرانی دروست بوو لەو کاتەوەی دەرگای ڕزق و ڕۆزی لەسەر موسڵمانان کرایەوە و بوونە خاوەنی دەسکەوت و دەسمایەیەکی زۆر، بە شێوەیەك ماڵە هەژارەکانیش شوێنەواری ئەو دەسکەوتانەیان پێوە دیار بوو، کە حاڵ و وەزعیان زۆر لە باشیدا بوو، کەچی ئەمان جاری واهەبوو بە تێپەڕبوونیەك مانگ بەسەریاندا ئاگر لە ماڵەکانیان نەئەکرایەوە، هەر بۆیە ناچار بوون و هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای بژێوی و ماڵی جوانیان لێ کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەك پێشەوا و ڕابەرێکی وریاو هۆشیار و هەست بە بەرپرسیارێتی بەدەم داواکەیانەوە نەهات و ڕەزامەندی خۆی دەرنەبڕی، هەر بۆیە ئەوانیش ڕۆژانە دووبارەیان ئەکردەوە و ئەیاندا بە گوێیدا تا تەواو بێزار و نیگەرانیان کرد، هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ ئەو مافەشی پێئەدان کە وەك مرۆڤێك خاوەنی ئەو هەست و نەستە بن، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەم کاتی ئەوەی نییە کە خۆی و خانەوادەکەی خەریك بن بە شتانێکەوە پەیامەکەیان لەبیر بەرێتەوە و مایەی دەسگر و سەرقاڵی بێت بۆیان، چونکە ژیانی دونیا تا بەدەمییەوە بچیت زیاتر کەمەندکێشت دەکات و فریای ناکەویت، وەك خواردنەوەی ئاوی دەریایە تا زیاتر لێی بخۆی زیاتر تینووتر ئەبی بۆ ئاو!**

**لەبەر ئەوە پێویستە ژیان سنووردار بکرێت بۆ ئەوەی بتوانرێ بەدەم کارە گرنگەکانی ترەوە بڕۆیت، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ توانی بە کەمترین کات و چاکترین شێوە**

بەرنامەکەی بەئەنجام بگەیەنێ، بەڕاستی زۆر جوان لە ژیانی دونیا تێگەیشتبوو. بەهەرحاڵ پاش تێپەڕ بوونی ماوەیەك بەسەر كێشەكەدا، بەم دوو ئایەتە پشتیوانی لە پێغەمبەر ﷺ دەكات و خێزانەكانیشی ئەخاتە نێوان دوو هەڵبژاردنەوە كە ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً * وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً)[81]. واتە: ئەی پێغەمبەر بە خێزانەكانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاتان دەوێت لەگەڵ جوانیەكانیدا، وەرن بابتان دەمێ و بە شێوەیەك جوان جیا ببمەوە لێتان، ئەگەر خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی هەڵدەبژێرن ئەوا خوا بۆ چاكەكاران لە ئێوە پاداشتی گەورەی ئامادە كردووە.

ئیبن كەسیر ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا ئەفەرموێ: ئەمە فەرمانێكە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ كە خێزانەكانی بخاتە نێوان دوو هەڵبژاردنەوە كە یا جوێ ببنەوە لێی و بچنە لای كەسانێك كە ژیانی دونیا و جوانییەكانیان بۆ فەراهەم بهێنێ، یاخود ئارام بگرن لەسەر ئەو تەنگی و نەدارییە و چاوەڕوانی پاداشتی خوایی ببن، ئەوانیش بە كۆی دەنگ خوا و پێغەمبەری خوا و ڕۆژی دواییان هەڵبژارد[82].

هەروەها لە كتێبی (كشاف القناع)دا ئاماژە بەوە دەكات كە بەم ئایەتە ئەو ئەركە كەوتە سەرشانی پێغەمبەر ﷺ كە خێزانەكانی بانگ بكات و هەڵبژاردن بداتە دەست خۆیان، تا خۆیان بە زۆرلێكراو نەزانن لەسەر ئارام گرتن بەرانبەر بەو ژیانە نەدار و هەژارییەی كە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی هەڵبژاردووە، واتە ناچار نەكرێن بە مانەوەیان لەو ژیانەدا[83].

81 سورة الاحزاب ( ٢٨ـ ٢٩).

82 مختصر تفسير ابن كثير، سورەتی الاحزاب.

83 كشاف القناع، ج٣، ص١٣.

ئیتر پاش دابەزینی ئەم ئایەتە کۆتاییان بەو کێشانە هێنا و هەریەکەیان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ مانەوە و ڕۆڵ و کاری بەرچاویان بینی لە گەیاندنی بانگەواز و پەیامی خواییدا.

## دەروازەیەك بۆ ئەم بەشە

نووسەر و وەرگێڕ لە کتێبی کچانی خوادا مەسەلەی حیجاب زۆر دڵی گرتوون و ئەوەی بشێ و نەشێ لە قسە دەربارەی باڵاپۆشی ئەیکەن.. دەقێك ئەڵێن: حیجاب بۆ گۆشەگیر کردنی ئافرەتانە.. حیجاب سەرەتا بۆ ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە کەچی دواتر سەپێنراوە بەسەر هەموو ئافرەتاندا.. کە ئەبینی باڵاپۆشی ئافرەت بۆ دوو ئامانجی گەورەیە، یەکێکیان: دروستکردنی کەلتورێکی تازە بۆ تێگەیشتن لە جنس و مەسەلەی سێکسی و بۆ ئەوەی پیاوان وەڵامی نیازی سێکسیان بە شتێکی ساختە نەدەنەوە کە بریتییە لە سەیرکردن و خۆتێرکردن لە ڕێگەی ناشەرعییەوە، دووهەمیان: دڵنیاکردنی هەموو ژنێك لەوەی مێردەکەی ناکەوێتە داوی ئافرەتێکی تر کە خۆی بۆ خەڵکی ئەنوێنێ و ئەوسەری لێ دەگرێ لە خۆجوانکردندا.. کەچی نووسەر یان وەرگێڕ خراپ حاڵی ئەبێ لەمەو وائەزانێ باڵاپۆشی (کبت) لە پیاواندا دروست دەکات و ڕێگەی ئازادییش ئەگرێ لە ژنان.

ئێمە دڵنیاین کە فەلسەفەی فەرزکردنی حیجاب لە ئیسلامدا زۆر لەوە گەورەترە کە ناحەزانی ئیسلام باسی دەکەن، چونکە ئەم باڵاپۆشییە دەیان و سەدان حیکمەتی تێدایە کە چ عەقڵ و چ زانست و چ ئەزموونی شەخصی خەڵك و میللەتان هەموو پشگیری لەو یاسا خودایییە ئەکەن.

حیجاب جوانییە، حیجاب دینداریيە، حیجاب بەڵگەی بوونی گیانی پێڕەویکردنە لە یاسا، حیجاب پاراستنی پێست و لەشە لە نەخۆشی، لە ڕەش بوونەوە، لە هەرزانفرۆشی، حیجاب قەڵغانە لەبەردەم ئافرەتاندا و تیری نەفسنزم و خەڵکی کەمتەرخەم گل ئەداتەوە، باڵاپۆشی ئازادییەکی تاکەکەسییە، زەوتکردنی ستەمە و دژایەتیکردنە لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا.. باڵاپۆشی ئارامییە بۆ دڵی ژن، ئارامییە بۆ

دڵی پیاو.. باڵاپۆشی خۆشی و لەزەتکردنێکە، زیاتر ئەوانە هەستی پێ دەکەن کە بەراورد لەگەڵ دوو قۆناغی بێحیجابی و قۆناغی حیجابداریدا، کێش بڕوا ناکات با تاقی بکاتەوە.. حیجاب پاراستنی خێزانە لە هەڵوەشاندنەوە، زۆرکردنی ڕێژەی (زەواجە) لەناو خەڵکدا، کۆنترۆڵکردنی سێکسە و سنوردانانە بۆ جنس... هەروەها.

سەیرە و زۆریش سەیرە دوژمنانی ئەم ئیسلامە ئەوەندە لە حیجاب ئەترسن و ئەوەندە دژایەتی حیجاب ئەکەن.. فەڕەنسای دایکی دیموکراتی هەر بە یاسا دنیا سەر و ژێر ئەکات لە پێناو یاساغکردنی حیجابدا، عەلمانیەکانی تورکیا حکومەتێکی هەڵبژێراوی گەل کە مایەی ئارامی و سەقامگیر بوونی باری ئابوری و سیاسی و تەعلیمییە کەچی لەسەر ئەوەی ئازادی حیجاب پۆشین دابین ئەکات، کودەتای لێ ئەکرێ و مەحکەمە و دادگایی ئەکرێ و بەرنامە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو حکومەتە بە خزمەتە دائەنێن. ئایا لەڕاستیدا حیجاب ئەوەندە ترسناکە و ئەوەندە ناسنامەیەکی بەهێزە بۆ ئافرەتانی موسڵمان.

نووسەر لەم بەشەدا کە بە ناوی (حیجابی پیرۆز) نووسیویەتی داخێکی زۆر ئەڕێژێت، بەڵام ئێمە تەنیا لە مەودا گشتییەکەیدا باسی حیجاب ئەکەین و ناچینە ناو وردەکارییەکانی بوختانەکانی ئەو..

وشەی حیجاب لە زمانەوانیدا بە ماناکانی: پەردە، چارشێو، پەچە، ڕووپۆش دێت[٨٤].

ئەو ئایەتانەی کە وشەی حیجابی تێدا هاتووە: ئایەتی پەنجا و سێی سورەتی ئەلئەحزابە کە خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ). واتە: ئەگەر پرسیارێکتان لێیان هەبوو، یا داوای کەل و پەلێکتان لێکردن با لە پشت پەردەوە بێت.

لێرەدا ئەم پشتی پەردەیە کە مانای حیجابە و لە ئایەتەکەدا دیارە تەنها تایبەتە بە هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ و مەدلولەکانی ئەو وشەیە لەو ئایەتەدا بریتییە لەو پەردەیەی کە دەوری دیوارێکی وەهمی دیوە و ژورێکی لە ژورێکی تر جیا کردووەتەوە.

---

[84] فەرهەنگی دەریا، بەشی یەکەم.

بەڵام ئەمڕۆ وشەی حیجاب بووەتە زمانی سەردەم بۆ جل و بەرگی ئیسلامی تایبەت بە ئافرەتانی ئیماندار، واتە وشەی حیجاب پێناسە و ناسینەوەی جل و بەرگی ئیسلامییە، گومان لەوەدا نییە کە حیجاب فەرمانێکی خواییە و ڕای هەموو زانایانی لەسەرە بە داپۆشینی سەر و لاشەی ئافرەتانی ئیماندار، جگە لە دەست و دەم و چاوی، بە پێی ئەم دەقە قورئانییە بەبێ گۆڕانکاری و تەئویل بۆ کردن.

کە خوای گەورە ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً) (الأحزاب: ٥٩).

واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ بە ژنەکانت و بە کچەکانت و بە ئافرەتانی ئیماندار با پۆشاکەکانیان بەسەر خۆیاندا بهێننە خوارەوە و خۆیانی پێ داپپۆشن، ئەو خۆداپۆشینە نزیکترە بەوەی کە بناسرێن و ئازار نەدرێن (بە نیازی خراپ). ئاشکرایە کە ڕووی خیتابی ئایەتەکە بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەر و ﷺ کچەکانی و ئافرەتانی ئیماندار بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تێکڕا چین و توێژی ئافرەتان داوالێکراون بە بەجێهێنانی ئەو فەرمانە بەبێ جیاوازی، با لەوپەڕی چڵەپۆپەی پاکی و نەزاهەتیشدا بن وەك خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ.

کەواتە گومان لە ئیسلامییەتی ئەم فەرمانەدا نییە وەك نووسەر ئەیەوێ گومانی لەسەر دروست بکات، ئایینی ئیسلام گرنگییەکی زۆری پێداوە و سنورێکیشی بۆ تەمەن دیاری کردووە کە بە پۆشینی ئەو جل و بەرگە هەڵسێت هەروەك دایکمان عائیشە رضي الله عنها ڕیوایەتی دەکات و ئەفەرموێ: (أنَّ أسماء بنت أبي بكر دخلت على النبي ﷺ وعليها ثياب رقاق فاعرض عنها وقال: ياأسماء ان المرأة اذا بلغت المحيض لم تصلح أن يرى منها الا هذا وهذا وأشار الى وجهه وكفيه)[85]. واتە: ئەسمائی کچی ئەبوبەکر چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ و کراسێکی تەنکی لەبەردا بوو، پاشان پێغەمبەر پشتی هەڵکرد و فەرمووی: (ئەی ئەسما! ئەگەر ئافرەت گەیشتە تەمەنی حەیز (خوێنی بێ نوێژی) بۆی دروست نییە جگە لەمەو لەوەی دیار بێت، ئیشارەتی کرد بۆ دەست و دەم و چاوی.

[85] رواه ابوداود في سنه، سەیری (مختصر تفسير ابن كثير، الصابوني /٢ / ٦٠٠ ) بکە.

دیارە یەکێك لەو شتە گرنگانەی کە مرۆڤی لە ئاژەڵ پێ جیادەکرێتەوە جل و بەرگ و خۆ ڕازاندنەوەیە و ئەو دوانەش دیاردەیەکن لە دیاردەکانی مەدنیەت و پێشکەوتن، ئەوەتا بە بەرەوپێشچوونی ژیان و زیاتر شارەزا بوونی مرۆڤەکانی چەرخی بەردین، وردە وردە جل و بەرگ و ئامرازی خۆ جوانکردن هاتە کایەوە، کەواتە خۆ دارِنین و خۆ ڕووت کردنەوە لە جل و بەرگ نیشانەی گەڕانەوەیە بۆ چەرخەکانی بەردین و کۆنەپەرستی. لێرەدا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە خۆداپۆشین لەگەڵ کامڵبوون و فیترەت و دروست بوونی مرۆڤەکاندا ئەگونجێ، بۆیە توانی بە عەقڵ و ژیری خۆی جل و بەرگێك هەڵبژێرێ کە مایەی جوانی و پاراستنی قەوارەی بێت (يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشاً)[٨٦] واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئێمە جل و بەرگمان کردە یاسا بۆتان تا ناشیرینییەکانتانی پێ بشارنەوە (کە مەبەستی جل و بەرگی ژێرەوەیە)، پاشان خۆشتانی پێ بڕازێننەوە وەك جل و بەرگی دەرەوەیە. (ریش) مەبەستی پێی پەڕە، کە چۆن باڵندە و پەلەوەرەکان جوان و ڕازاوە ئەکات، بە هەمان شێوە جل و بەرگی دەرەوەش ئەبێتە ڕازاندنەوەی خاوەنەکەی.[٨٧]

## سیفەتەکانی (حیجاب) جل و بەرگی ئیسلامی:

بۆ ئەوەی حیجاب نەبێتە (مێردەزمە)یەك لە خەڵکی بەدبین و ناحاڵی لە ئیسلام، بە باشی ئەزانین کورتەیەك لە مەرجەکانی حیجابی ئیسلامیی بنووسین:

١ـ پێویستە ئەو جل و بەرگە خۆی لە خۆیدا گوشاد و فراوان بێت، واتە داپۆشەری هەموو ئەندامەکانی لەشی بێت بێجگە لە دەست و دەم و چاو و لەشی ئافرەتەکە نەگوشێ بەڕادەیەك شوێنە هەستیارەکانی پیشان بدات.

٢ـ پێویستە ئەوەندە ئەستور بێت کە وەك پێویست ئەندامەکانی ژێرەوە داپۆشێت و بیپارێزێت لە بینین، واتە تەنك نەبێ و سیفەتی (نساء کاسيات عاريات) وەرگرن،

86 الأعراف الأية (٢٦).

87 فقه السنة / سيد سابق / (ج٢ ص٢٠٩).

**مەبەست لە ژنانی ڕووت و پۆشتە ئەوەیە کە جل و بەرگیان لەبەردایە هەندێك لە لاشەیان داپۆشیوە و هەندێکی تریان بە دەرەوەیە.**

**٣ـ پێویستە بریق و باق و ڕازاوە نەبێت، چونکە ئەسڵ لە بوونی حیجابدا داپۆشینی جوانیەکانە (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) یا (وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى) لێرەدا مەبەست لە (تبرج) دەرخستنی جوانییەکانە بۆ خەڵکی بێگانە.**

**٤ـ نابێت ئەو حیجابە بۆنخۆش بکرێت کە سەرنجی پیاوان ڕابکێشێت، چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی وروژاندنی ئارەزووی پیاوان بۆنی خۆشە.**

**٥ـ پێویستە ئەو حیجابە هاوشێوەی جل و بەرگی پیاوان نەبێت کە ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی کە جل و بەرگی ئافرەتان ئەپۆشن و لەو ئافرەتانەی کە جل و بەرگی پیاوان ئەپۆشن[٨٨].**

**٦ـ پێویستە ئەو جل و بەرگە هاوشێوەی جل و بەرگی ئافرەتانی بێ باوەڕ نەبێت، هەروەك عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێ بێت ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: هەرکەسێك خۆی بشوبهێنێ بە هەر گەل و نەتەوەیەك ئەوا لەسەر ئەوان حساب دەکرێت[٨٩].**

**بۆ ئەوەی ئافرەتانی ئیماندار پارێزگاری لە کەسایەتی و ناسنامەی ئیسلامی خۆیان بکەن و شانازی بەو حیجابەوە بکەن داوا و فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشیویانە پێویستە چاودێری ئەو خاڵانەی سەرەوە بکەن[٩٠] و دەست شل نەکەن بۆ نەفس و فشاری خەڵکی.**

[88] عن أبي هريرة رضي الله عنه (لمن رسول الله ﷺ الرجل يلبس لبسة المرأة والمرأة تلبس لبسة الرجل)، أخرجه أحمد، وأبوداود والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

[89] عن حديث ابن عمر عن رسول الله ﷺ قال: من تشبه بقوم فهو منهم). حسنه السيوطي وقال ابن تيمية سنده جيد وصححه ابن حبان.

[90] الى غير المحجاب أولاً ولى المحجبات ثانياً، محمد سعيد مبيض.

**بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ لەکۆمەڵگای کوردەواریدا (حیجاب) مانای خۆی ناوە بەدەستەوە، بەڵکو ئەو جل و بەرگەی کە ئەپۆشرێت لە لایەن ئافرەتانەوە خۆی لە خۆیدا مایەی وروژاندن و کردنەوەی دەرگای خراپەیە، بگرە زیاتر سەرنجی ڕەگەزی بەرانبەر بە لای خۆیاندا ڕادەکێشن. وەك تەنورە و بلوز و لەچکێك یا پانتۆڵ و بۆدی و لەچکێك نازانیت ناوی بنێیت چی؟ جل و بەرگ یا دەرخستنی وێنەی ئەندامە سەرنجڕاکێشەکان بە شێوازێکی جوانتر و ڕازاوەتر، بە ڕاستی پێویستە خوشکانی ئیماندار خۆیان ژیرانە سەرنج لە خۆیان بدەن و بەرگەکانیان هەڵسەنگێنن تا بزانن چەندە مانای حیجاب تیایاندا بەرجەستە و چەندە لەو مەرجانە دوور کەوتوونەتەوە.**

## ئامانج لە بە یاساکردنی حیجابدا چییە؟

**لە سەرەتادا دەڵێین: ئەو حیجابەی کە ئایینی ئیسلام فەرزی کردووە لەسەر ئافرەتان، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو ئافرەتە لە چوار دیواری ماڵ نەچێتە دەرەوە و بەشداری لە چالاکییەکانی ژیان نەکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە یاسای حیجابکردن بۆ ئەو کاتانە دانراوە کە ئافرەت تێکەڵاوی خەڵك و پیاوانی بێگانە دەکات، ئەگینا لە ماڵی خۆیدا هیچ پێویستییەکی بە داپۆشین نییە (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ. ..) واتە: ئەی موحەممەد بڵێ بە ئافرەتانی ئیماندار با چاوەکانی خۆیان داخەن لە ئاست پیاوانی نامەحرەمدا (بێگانە) و داوێنی خۆیان بپارێزن، جا ئەگەر ژنان و پیاوان تێکەڵییان بۆ دروست نەبێ، ئەوا چ پێویست ئەکات چاوی خۆیان دابخەن؟ دیارە کە پیاو و ئافرەت وەك یەك بەرپرسن لە بونیادنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی، هەر بۆیە ئیسلام وەك ئاینێك مامەڵە لەگەڵ ڕاستییەکانی ژیاندا ئەکات و بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نادات بە پیاوان چێژ و لەزەت لە هەر ئافرەتێك وەرگرن، مەگەر لە سنووری خێزان و لەژێر یاسای هاوسەریدا نەبێت.**

**بەڵگە نەویستیشە کە پۆشینی حیجاب لە لایەن ئافرەتانەوە پارێزگاری لە کۆمەڵێك بەهای بەنرخ دەکات، کۆمەڵگا ئەپارێزێت لە هەندێ دەردی کۆمەڵایەتی وەك:**

## یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی خێزان (تفكك الأسرة):[٩١]

ئەزموون دەریخستوە کە بێ حیجابی تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەز بە ناوی ئازادی ڕەهاوە هۆیەکی گرنگە بۆ هەڵوەشان و بچڕانی شیرازەی خێزان و کەمبوونەوە و نەمانی متمانە و خۆشەویستی، بەتایبەت لە نێوان (ژن و مێرد)دا. بۆ نموونە: لە هەموو فەرمانگە و دام و دەزگا میرییەکاندا دیاردەی بێ حیجابی و تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەز بەبێ سنوور، دیاردەیەکی بەرچاوە و زیانێکی زۆری لە پەیوەندییە خێزانییەکان داوە، ئەگەر سەرنجی کچان و ژنان بدەین بەو هەموو خۆڕازاندنەوە و جۆری تەسریحە و قلیانەوە بەرانبەر بە هاوکارەکەی یا بەڕێوبەرەکەی یا... هتد. دادەنیشێ و ڕۆژانە گفتوگۆ و پێکەنین و گاڵتە و گەپ کارێکی ئاسایی دەبێت تا ئەوە ڕوو ئەدات کە شاعیرەکە ئەیڵێت: نظرة فاتبامة فسلام * فكلام فموعد فلقاء.

ئەوکاتە دڵی پیاوان کەمەندەکێش ئەکرێت و لە ماوەیەکی کەمدا ئەو ڕێز و خۆشەویستییەی کە بەرانبەر هاوسەرەکەی و شەریکی ژیانییەتی ئاوەژوو ئەبێتەوە بە ئاراستەی بیانوو گرتن و شەڕ پێگێڕانی و گرنگی نەدانی پێی بەوەی کە جوان نییە یا خۆی ناڕازێنێتەوە یا و یا و یا.... هتد. وەك ژنانی تر، ئەوە لەبیر ئەکات کە ئەو جوانییە تەزویرە و حەقیقی نییە، بەڵکو وائەزانێ ئەو هاوکارەی کە لە دەرەوە ئەیبینێ و ئارەزووی دەکات بە هەمیشەیی بەو شێوەیە نییە کە ئەڵێی ئەو کاتەیە و بە بووکی ئەبرێت، سەرەنجام ژیانی ئەو هاوسەرە لە دوو کار بەدەر نابێت: یا ئەوەتە بە خاتری ماڵ و منداڵ بەرگەی هەموو سەختییەکانی ژیان بگرێت، یا ناچار ئەبێت بە وەرگرتنی تەڵاق و جیائەبێتەوە. ئاشکرایە کە خوای گەورە غەریزەی جنسی لە مرۆڤەکاندا دروست کردووە بۆ مانەوەی جۆر و بەردەوامی بە ژیان، بەڵام لەهەمان کاتیشدا فەرامۆشی نەکردووە، بەڵکو سنووورداری کردووە لە چوارچێوەی خێزان و هاوسەرگیریدا بۆ ئەوەی پشێوی و سەرگەردانی ڕوو نەدات، کە زۆر لە پیاوان دەستبەرداری هاوسەرەکانیان بوون بە خاتری گەیشتنیان بە هاوڕێ و هاوکاری تازە.

---

[91] سەیری کتێبی (الی المحجبات أولا) لمحمد سعید مبیض بکە.

دووەم: کەمبوونەوەی ڕێژەی پرۆسەی هاوسەرگیری و زیاد بوونی قەیرەیی و بەرز بوونەوەی ڕێژەی تەڵاق لەناو کۆمەڵگا.

كاتێك كە گەنجەكان توانيان بە ئاسايى و ئاسانى غەريزەى جنسى خۆيان تێر بكەن و ويست و ئارەزووەكانيان بهێننە دى، بەبێ هيچ تەكليفێكى ماڵدارى و پێداويستييەكانى هاوسەرگيرى، ئەو كاتە پشت لە ژن هێنان هەڵئەكات و كچانێكى زۆر بەبێ ماڵ و مەحروم لە دايكايەتى كە مافى خۆيەتى ئەمێننەوە و ژنانيش جارێكى تر ئەكەونە بەر گورزى تەڵاقو بێبەشبوونيان لەهەر ئەركو مافێك كە چەندين ساڵە ڕەنجيان لەپێناودا داوە و ئەمەش واقعێكەو هەيەو خۆزگە دەزگايەكى پەيوەنديدار ئامارێكى لەوبارەيەوە ئەكرد تا دەربكەوتايە بێحيجابى و خۆجوانكردنى ئافرەتان چەند ماڵى ئارامى وێران كردووە!!

سێهەم: نەمانی هاوسەنگی دەروونی:

كاتێك كە كۆمەڵگا ئەو بارەى بە خۆيەوە دى ئەوا هيچ كام لە دايك و باوك و ژن و مێرد و كوڕ و كچ بەرانبەر بەيەك متمانەيان نامێنێ و لە دەستى دەدەن و هەميشە قەلەق و دڵەڕاوكى كاڵاى باڵايان دەبێت، بەڵام بە پاراستنى سنوورەكانى خوا لە نێوان هەردوو ڕەگەزى ژن و پياودا خۆى بۆ خۆى هاوسەنگييەكى دەروونى دروست ئەكات و هەريەكە لەو ژن و پياوە تەنها گرنگييان بە يەكتر دەبێ و هەميشە لە ڕازيكردنى دڵى يەكتر دەگەڕێن، يا دايك و باوك بێ غەم دەبن لە چوونە دەرەوەى كوڕ و كچەكانيان. ...هتد.

چوارەم: بڵاوبوونەوەی بێ سەروبەر لە سێکسدا (انتشار الفوضى الجنسية):

دواى ئەوەى كە هەردوو ڕەگەز پەيوەست نەبوون بە سنوورەكانى خۆپاراستن، وەك: چاو داخستن لە ئاست يەكتر (نێر و مێ)و پۆشينى جل و بەرگێك لە لايەن

ئافرەتانەوە کە پیاوان سەرخۆش ئەکەن بە خۆیان، ئەو کاتە زۆر بە ئاسانی لە یەکتر نزیك دەبنەوە و ئەوەی ڕەوشت و قەوارە بێت لەبەر چاو ناگیرێت، تا سەرئەنجام خۆیان لەناو کۆمەڵێك زیان و نەخۆشی و دەردی سەریدا دەبیننەوە، هەر بۆیە بە پێویستی ئەزانم هەندێك لەو زیانانەی کە ئاماژەمان پێدا کورتەیەکی بخەینە بەرچاو تا خوێنەری بەڕێز کەمێك ئاگاداری بەرهەمی بێ ڕەوشتی و تێکەڵاوی ڕەها و بەرەڵایی و بێ بەرنامەیی لە تێرکردنی غەریزەی جنسی ببینێت:

## ١- زۆر بوون و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانی ئایدز و زوهری و سیلان و... هتد:

کە کۆمەڵە نەخۆشییەکی خۆرەو کوشندەن بۆ گیان و لاشەی مرۆڤ بێ ئەوەی چارەیەك بکرێت، ئەوەتا ساڵانە وڵاتانی ئەوروپا و ئەفریقا بە بلوێن دۆلار خەرج ئەکەن بۆ قەڵاچۆکردنی ئەو ڤایرۆس و نەخۆشیانە کەچی هەر بێ سوودە، چونکە نەخۆشییەکن بەتایبەت ئایدز کە توانای بەرگری لە مرۆڤدا ناهێڵێ و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو تیاچوون و پوکانەوە دەیبات جگە لەو هەموو ئازارەی کە پێوەی ئەتلێتەوە، کە لە تازەترین ئاماردا تەنیا لە کیشوەری ئەفریقا چل ملیۆن خەڵك بەو دەردەوە گیرۆدەن، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ دەربارەی نەخۆشییەکانی بێ ڕەوشتی فەرمویەتی: (لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضوا في أسلافهم الذين مضوا)[٩٢].

واتە: هەرکاتێك بێڕەوشتی لەهەر میللەتێکدا پەیدا بوو، کە بە شێوەیەکی ئاشکرا (ببینرێ و ببیسرێ) ئەو کاتە نەخۆشییە سارییەکان مەرگی ڕەش (تاعون) لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە، کە لەوەو پێش لەناو باو و باپیرانیاندا نەخۆشی بەو شێوەیە نەبووە. ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە ساڵانێك بەر لە ئێستا خەڵکی وابەستەی ڕەوشت و داوێن پاکی بوون، نەخۆشییەکی بەم شێوازە نە ئەبیسران، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ لە ئەنجامی ئەم بێ ڕەوشتی و بەرەڵاییە بیستن و ئەژمارکردنی ئەم نەخۆشییانە

[92] رواه ابن ماجة.

بووەتە شتێكی ئاسایی لەبەرچاو خەڵكی، هەروەك دكتۆر سیلیاس دمشیم ئەڵێت: هیچ كاتێك بەلامەوە سەیر نییە كە گوێبیستی ئەو ڕێژە زۆرەی نەخۆشییە جنسییەكان ئەبم و لەدایك بوونی مندالانی ناشەرعی، چونكە هەمووی بەرهەمی سروشتی كۆمەڵگاكانی ئەمڕۆیە كە پێیدا تێپەڕ ئەبێت[93]. هەروەها لە ڕاپۆرتێكی سكرتاریەتی كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا بۆ كاروباری كۆمەلایەتی و ئابووری داهاتووە كە: ئەو ئافرەتانەی بەكاری پەیوەندییە سێكسییە قەدەغەكراوەكان هەڵدەستن هۆكارن بۆ بلاوبوونەوەی نەخۆشییە سێكسییەكان[94].

## ٢ـ زەوت كردن (الإغتصاب):

كاتێك كە كۆمەڵگا شێوازێكی ئاژەڵی مرۆڤەكانی بەخۆیەوە دەبینی، پەلاماردان و ئیغتیصاب ڕووبەڕووی زۆرینەی تاكەكانی كۆمەڵگا ئەبێتەوە، بۆ نموونە: لە وڵاتانی پێشكەوتوو لە بواری تەكنەلۆژیای وەك ئەوروپا و بەتایبەت فەرەنسا ڕۆژانە بە سەدان ئافرەت ئیغتصاب دەكرێن، لە هەموو چركەیەكدا ئافرەتێك بەهۆی ئازارەكانی سكپڕی و منداڵ بوونەوە (مضاعفات الحمل الولادة) گیان لەدەست دەدات، ساڵانە یەك ملیون منداڵ بە كوڕ و كچەوە ئیغتصاب دەكرێن، ئەوەتا لێكۆڵینەوەیەكی جیهانی دەری دەخات كە (٢٥٪)ی مندالانی دانیمارك ڕووبەڕووی ئەو تاوانە پیس و قێزەونە دەبنەوە، تاوانبارانیش زۆربەی چین و توێژەكانی كۆمەڵگا دەگرێتەوە، كە زۆربەیان لە لایەن باوكی ئالودەبوو بە ماددە هۆشبەرەكان و تەنانەت مێردی دایكەكانیشیان، هەروەها (٦٪)ی مندالانی سوید و (١٤٪) مندالانی نەرویجیش بوونەتە قوربانی ئەو تاوانە قێزەوونە، دیارە ئەم ڕێژەیە بەفەرمی سەرژمێركراوە، ئەگینا لەڕاستیدا ڕێژەكە زۆر لەوە زیاترە كە بە نهێنی و دوور لە چاوی خەڵكی و میدیاكان ئەكرێت لە جیهاندا[٩٥].

## ٣ـ كوشتنو بڕینو لێدان.

---

[93] محمد سعید مبیض / الی غیر المحجبات أولاً و الی المحجبات ثانیاً / ص٧٠

[94] محمد کرد / الأسلام والحاضرة / ص ٢ — ٩٢

[95] له مجلة (البیادر السیاسي) العدد / ٣٤٠ / السنة الثامنة / ٢/١٨/ ٩٨٩ / ص٣٧.

له‌ ئه‌نجامی ئه‌و به‌ره‌لاییه‌ی كه‌ له‌ كۆمه‌لگادا دروست ئه‌بێت سالأنه‌ (٥٠٠٠) پێنج هه‌زار ئافره‌ت ئه‌كوژرێت به‌ تاوانی ناموس پارێزی (غسل عار)، كه‌ ئه‌م ئافره‌ت كوشتنه‌ ته‌نیا په‌یوه‌ندییه‌ نییه‌ به‌ كۆمه‌لگا دواكه‌وتووه‌كانه‌وه‌، به‌لكو له‌ ولأتانی ئه‌وروپا و ڕۆژئاوا به‌ گشتی هه‌مان كار مومارەسه‌ ئه‌كرێت.

**٤ـ په‌نابردن بۆ خواردنه‌وه‌ی مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان:** بۆ ئه‌وه‌ی به‌ حسابی خۆیان له‌و دونیا پڕ له‌ كێشه‌یه‌ بچنه‌ ده‌ره‌وه‌ و به‌خه‌یالٚ بچنه‌ دونیایه‌كی تری خۆش و له‌وێدا ڕاببوێرن!!

**٥ـ (برودی جنسی) واته‌ سڕو سۆڵی له‌ كاری جنسیدا:** (٤٠٪)ی ئافره‌تانی ئه‌مریكی و به‌ریتانی تووشی ئه‌م نه‌خۆشییه‌ بوون، هه‌ر بۆیه‌ ناچار ئه‌بن په‌نا به‌رنه‌ به‌ر به‌كارهێنانی حه‌ب و جۆره‌ها ده‌رمانی سێكسی كه‌ سه‌رئه‌نجام به‌ره‌و حالٚی خراپترِیان ده‌بات و تا دێت قوڕه‌كه‌یان بۆ خه‌ستتر ئه‌كاته‌وه‌.

**٦- (شذوذی جنسي) واته‌ په‌نابردن بۆ كارێكی ناباوی و ناشیرین له‌ كاری سێكسدا:** كه‌ په‌نا ده‌باته‌ به‌ر هاوجنسی خۆی له‌وكاره‌دا، كه‌ ئه‌مه‌ش بووه‌ته‌ یه‌كێك له‌ ده‌رده‌ ڤێزه‌ونه‌ كۆمه‌لأیه‌تییه‌كان له‌م ڕۆژگاره‌دا.

**٧ـ زۆربوونی مندالٚی ناشه‌رعی:**

دوای ئه‌وه‌ی كه‌ ڕه‌وشت له‌ ناو كۆمه‌لگادا نه‌ما و سنووره‌كانی خوایی به‌زێنران مندالێكی زۆر له‌ ڕێگای ناشه‌رعیه‌وه‌ په‌یدا ده‌بن، دیاره‌ له‌و كاته‌دا ده‌ولٚه‌ت ده‌بێته‌ خاوه‌نی ئه‌و مندالأنه‌ له‌ ڕووی بژێوییه‌وه‌ ئه‌ویش بۆ ماوه‌یه‌ك و ته‌مه‌نێكی كه‌م، بێگومان ئه‌م جۆره‌ مندالأنه‌ هه‌ر له‌ سه‌ره‌تاوه‌ بێبه‌شن له‌ هه‌موو سۆز و خۆشه‌ویستییه‌ك، له‌ هه‌مان كاتیشدا له‌ ژێر كاریگه‌رییه‌كی خراپ و ناهه‌مواردا گه‌وره‌ ده‌بن، هه‌ر بۆیه‌ ئه‌مانیش كاریگه‌رسی خراپیان ده‌بێت له‌سه‌ر كۆمه‌لگا، كه‌ جۆره‌ها تاوانی وه‌ك دزی و كوشتن و بێ ڕه‌وشتیان پێ ئه‌نجام ده‌ده‌ن.

بێ ئەوەی سڵ بکەنەوە لە هیچ لۆمە و سەرزەنشتێك، چونکە کەسێك لە لۆمە خۆی ئەپارێزێت کە خاوەنی خێزان و کەسایەتی بێت.

لە مانگی (٢٠٠٧/٩)ی زاینی کەناڵی (ئەلجەزیرە) بە دوورودرێژی ڕاپۆرتێکی لەسەر خانەکانی لەشفرۆشی پێشکەش بە بینەران کرد کە بووەتە خۆرەیەکی کۆمەڵگای هیندی، زیاتر باسی لەو منداڵانە دەکرد کە لە ڕێگای ناشەرعییەوە لە دایك بوون و تووشی جۆرەها تاوان و توندوتیژی بەرانبەریان لە کاری سێکسیدا و تووش بوونیان بە نەخۆشییە ترسناکە سێکسییەکان.

خوێنەری بەڕێز ئەمانە کەمێك بوون لەو زیانانەی کە بەرهەمی بێ حیجابی ئافرەتانە و تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەز بەبێ سنوور، هیوادارم بەرچاوڕوونییەك بووبێت بۆ نووسەر و وەرگێڕ و خوێنەران، مایەی ئەوە بێت کە توێژینەوە لە ئەم بابەتە بکەن و بیخەنە تەرازووی عەقڵ و عورف و شەرعەوە تا بزانن ئەو سنورەی کە خوای گەورە پیاو و ژنی وابەستە کردووە پێیانەوە هەر هەمووی حیکمەتە و داخستنی دەرگای تاوان و خراپەکارییە و لە ئەنجامدا ئەو یاسایە بەخێری تاك و کۆمەڵگە تەواو دەبێت.

پاش ئەوەی کە پێناسەیەکی کورتمان کرد بۆ حیجاب و پێویستی تاك و کۆمەڵ پێی، ئاماژە ئەدەین بەهەندێك لەو گومان و بە هەڵەداچوونەی نووسەر سەبارەت بەحیجاب و ئەو کەسانەش کە ئەیپۆشن کردوویەتی:

**١٧- نووسەر لە لاپەڕە (١٢)دا ئەڵێت:** "خوا ئایەتێك دەنێرێتە خوارەوە بۆ موحەممەد داوای لێدەکات ژنەکانی گۆشەگیر بکات، هەندێك لەم ژنانە لەبەرەکانی جەنگدا برینپێچ بوون، هەندێکی تریان لە مزگەوتدا لەسەر ئاینی تازە خەریکی وتاردان بوون، بەڵام ئێستا چاوەڕوانییان لێدەکرێ لە ناو ماڵدا لە پشت پەردەوە خۆیان بشارنەوە"، ئەم قسەیەی سەرەوە جگە لەو بێ نەزاکەتییەی تێیدایە یەك پارچە بوختانیشە بە هیچ شێوەیەك مێژووی ژیانی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پشتگیری ناکات، چونکە لە ڕاستیدا حیجاب خێزانەکانی پێغەمبەری ﷺ گۆشەگیر نەکرد، بەڵکو ئەو حیجابەی کە تایبەتە بەوانەوە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد

فەرمانێکی خوایی بوو (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ) بۆ ئەوەی ماندوێتی و بێزاری ڕوو نەکاتە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بە هۆی هاتووچۆی هەمەچەشنەی خەڵك، پاشان پارێزگاری کردن لەو پیرۆزی و سەروەرییەی کە لە دڵی ئیمانداراندا هەیانبوو.

ئەگینا مەبەست لەو پەردەیەی کە خوای گەورە دیاری کرد بۆیان گۆشەگیرکردنیان نەبوو، نەبووە ڕێگریش لەئاست بەشداری کردنیان لە چالاکییەکانی ژیان، بەڵکو زۆر ماندوویینەناسانە لە هەموو بوارێکدا جێگا دەستیان دیار بووەو بەشداری هەموو بۆنەکانیان کردووە:

## ١- بەشدارییان لە شایی و خۆشییەکاندا کردووە.

دایکمان عائیشە رضي الله عنها کچێکی بێ باوکی لە لا ئەبێت، پاشان ئەیدات بە شوو، لەو کاتەدا کە ئامادەیان کردووە بیبەن بۆ پیاوێکی مەدینەیی، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (عائیشە چیتان پێیە کە مایەی دەربڕینی خۆشحاڵی و ئاسوودەیی بێت؟ مەدینەییەکان خۆشحاڵییان لەو شتانە دێت). مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە ئایا کەنیزەکی گۆرانی بێژتان دیاری کردووە تا دەف لێدا و گۆرانی بڵێت؟ کەواتە بەپێی ئەم فەرموودەیە بۆمان دەرئەکەوێت کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ وەك ژنانی تر لە خۆشییەکاندا بەشدارییان کردووە[96].

## ٢- بەشداری یان لە بۆنە و جەژنەکاندا کردووە:

[96] اخرج الأمام البخاري عن عائشة رضي الله عنها أنها زفت امرأة الى رجل من الانصار، فقال النبي الله ﷺ يا عائشة ماكان معكم لهو؟ فان الأنصار يعجبهم اللهو. وجاء في شرح هذا الحديث للإمام ابن حجر العسقلاني: أن هذه المرأة يتيمة في حجرها فهل بعثتم معها جارية تضرب بالدفِ وتغني.

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێت) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کچەکانی و هاوسەرەکانی لە ڕۆژانی جەژندا بردۆتە دەرەوە [97].

عائیشە فەرمووی: (لە ڕۆژی جەژندا دووان لە ڕەش پێستەکان یان حەبەشییەکان یارییان بە قەمە و قەڵغان دەکرد، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەیان، پێغەمبەریش فەرمووی: حەز ئەکەیت سەیریان بکەیت؟ وتم: بەڵێ، پاشان منی لە دوای خۆیەوە وەستان و خۆمم دا بە سەر شانیدا بە شێوەیەك کە ڕومەتم لە ڕومەتی ئەکەوت و پێغەمبەر ﷺ هانی حەبەشییەکانی ئەدا تا بەردەوام بن لە یارییەکەیان تا ماندوو بووم ئینجا فەرمووی: بەسە بۆت؟ وتم: بەڵێ [98].

## ٣ـ بەشداریی کردنیان لە گەیاندنی زانست و زانیاری دا:

بێگومان فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ سەرچاوەیەکی دووەمی یاسادانانە، خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆڵی گەورەیان بووە لە گەیاندنی وتەو کردار و ڕەوشت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەر ﷺ بە کۆمەڵی موسڵمانان. هەروەك راوییەکانی فەرموودە باسیان لەوە کردووە کە خێزانەکانی پێغەمبەر زیاد لە (٣٠٠٠) فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، خاتوو عائیشە خاوەنی گەورەترین پشك بووە لەم بوارەدا بە هۆی زیرەکی و زۆر مانەوەی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ کە (٢٢١٠) فەرموودەی گەیاندووە، پاشان ئوم سەلەمە (٣٧٨) فەرموودە و خێزانەکانی تریش لەنێوان (١١-٦٥) فەرموودەیان گێراوەتەوە (رەزای خوا لە هەموویان بێت) وە توانیویانە ببنە مەرجەعێك بۆ موسڵمانان لە هەر پرس و ڕایەك کە بوویانە بە تایبەت لە کاروباری ئافرەتاندا، ئەوەتا ئیمام عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەر پرس و گرفتێکی دەربارەی ئافرەتان بۆ پێش بهاتایە ڕووبەڕووی خاتوو حەفسەی کچی دەکردەوە، ڕۆڵ

---

[97] عن ابن عباس (أن النبي ﷺ كان يخرج بناته ونسائه في العيدين) ابن ماجه .

[98] عن عائشة قالت: (.. وكان يوم عيد يلاعب فيه السودان بالدرق والحراب، فأما سألت النبي ﷺ واما قال: تشتهين تنظرين؟ قلت نعم، فأما منى وراءه خدي على خده وهو يقول: دونكم بابنى أرخدة حتى اذا مللت قال: حسبك قلت نعم. وفي رواية: فاقدروا قدر الجارية. الحديثة السن لتسمع اللهو. انظر سلسلة الاحاديث الصحيحة للألباني برقم ٣٠٩ وأخرجه البخاري في الماجد (١ / ١١٦).

و كارامەییان لەم بوارەدا بۆ هەریەكەیان بە كورتی لە ژیانە پیرۆزەكانیاندا ئاماژەمان پێداوە.

## ٤ـ بەشداریی كردنیان لە كاری سیاسی و شەڕ و پێكدادان بەرانبەر بە دوژمن:

## ئەگەر بێتو بە وردی سەرنجی ژیانی هەریەكە لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ بدەین بۆمان دەرئەكەوێت كە ڕۆڵی تایبەت و گرنگیان لەو بوارەدا هەبووە، بۆ نموونە:

أ ـ پێشنیارەكەی ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ پێغەمبەر ﷺ لە كاتی پەیمانی حودەیبیەدا و ڕزگار كردنی موسڵمانان لەو حاڵەتە نەخوازراوەی كە پێغەمبەر ﷺ ترسی بە هیلاكا چوونی لێ ئەكردن[99].

ب ـ خەمخواردنی خاتوو عائیشە بەرانبەر بە ئەمیر و سەركردە و ژێر دەستەكانیان[100].

[99] عن المسور بن مخرمة ومروان يصدق كل منها حديث صاحبة قالا: خرج رسول الله ﷺ زمن الحديبة فجاء سهيل بن عمرو فقال: هات اكتب بيننا وبينكم كتاباً فدعي النبي ﷺ الكاتب فقال: (اكتب... فلما فرغ من قصة الكتاب) قال رسول الله ﷺ لاصحابة قوموا فانحروا ثم احلقوا. قال: فوالله ماقام منهم رجل حتى قال ذلك ثلاث مرات فلما لم يقم منهم أحد دخل على أم سلمة فذكر لها مالقى من الناس فقالت أم سلمة: يانبي الله أتحب ذلك؟ اخرج ثم لاتلكم أحداً منهم كلمة حتى تنحر بذلك وتدعوا حالقك فيحلقك. فخرج فلم يكلم أحداً منهم حتى فعل ذلك، نحر بدنة و دعى حالقه فحلقه فلما رأوا ذلك قاموا فنحروا وجعل بعضهم يحلق بعضا.. رواه البخاري.

[100] عن عبدالرحمن بن شماسة قال: أتيت عائشة أسألها عن شيئ فقالت: من أنت؟ فقلت: رجل من أهل مصر، فقالت: كيف كان صاحبكم لكم في غراتكم هذه؟ فقال: ما نقمنا منه شيئاً ان كان ليموت للرجل منا البعير فيعطنه البعير، والعبد فيعطيه العبد، ويحتاج الى النفقة فيعطيه النفقه، فقالت: أما أنه لايمنعني الذي فعل في محمد بن أبي بكر أخي، أن اخبرك ماسمعت من رسول الله ﷺ يقول فيه بيتي هذا: اللهم من ولي من أمر أمتي شيئاً فشق عليهم فاشقق عليه، ومن ولي من أمر أمتي شيئاً فرفق بهم فارفق به. رواه مسلم.

**ج ـ رابەرایەتی کردنی سوپای عێراق لە لایەن خاتوو عائیشەوە و سووربوونی لەسەر تۆڵەکردنەوە لە بکوژانی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوایان لێ بێت)[101].**

**د ـ خاتوو حەفسەو گرنگی دانی بە خیلافەت پاش مردنی باوکی، واتە لە خەمی ئەوەدا بوو کە باوکی کەسێکی لە شوێنی خۆی دانەناوە تا پاش خۆی موسڵمانان شپرەزە و بێ شوان نەمێننەوە و مێژوویش شتی زۆری لەم جۆرە هەڵوێستانە بۆ تۆمار کردووین[102].**

**١٨ـ نووسەر ئەڵێت: "یاسای گۆشەگیر کردنی خێزانەکانی موحەممەد پارێزگاری کردن بوو لە ناوبانگیان، بەڵام وردە وردە بەسەر ژیانی تری موسڵماندا دەسەپێنرا"، پاشان دەڵێت: "ژنانی عەرەبی سعودیە تا ئێستا لەپشت پەردەوە، دابڕاو لە جیهانی دەرەوە دەژین. لە سعودیەدا هیچ ژنێك بۆی نییە خۆی بکات بە هیچ هۆتێلێکدا لەبەر ئەوەی وا بڕیارە وەك ژنەکانی (موحەممەد) کونجیماڵەوە جێگایان بێت".**

**لە وەڵامدا ئەڵێین: پێشتر باسمان کرد کە پشتی پەردە مانای گۆشەگیرکردنی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ نەبوو، هەروەك نووسەر خۆشی ئاماژەی پێدەکات کە پارێزگاری لە ناوبانگیان بوو، فەرمانەکەش تەنها تایبەت بوو بەوانەوە، نەك ئافرەتانی تری موسڵمان، پاشان دەربارەی ژنانی سعودیە و وڵاتانی تری ئیسلامی کە**

---

[101] عن أبي مريم عبدالله بن زياد الأسدي قال: لما سار طلحة و الزبير و عائشة الى البصرة، بعث علي عمار بن ياسر وحسن بن علي فقد ماعلينا الكوفة فصعدا المنبر. فكان الحسن بن علي فوق المنبر في أعلاه وقام عمار أسفل من الحسن فاجتمعنا اليه فسمعت عماراً يقول: إن عائشة قد سارت الى البصرة والله إنها لزوجة نبيكم ﷺ في الدنيا والآخرة ولكن الله تبارك وتعالى ابتلاكم ليعلم اياه تطيعون أم هي؟ رواه البخاري.

[102] عن ابن عمر قال: دخلت على حفصة فقالت: أعلمت أن أباك غير مستخلف؟ قال: قلت: ماكان ليفعل قالت: انه فاعل. قال: فحلفت أني اكلمه في ذلك. فسكت حتى غدوت ولم اكلمه، قال: فكنت كأنما أحمل بيميني جبلاً حتى رجعت قد خلت عليه فسألني عن حال الناس وأنا أخبره فقال: ثم قلت له: اني سمعت الناس يقولون مقالة فى آليت أن اقولها لك. زعموا انك غير مستخلف وانه لوكان لك راعي أبل أو راعي غنم ثم جاءك وتركها رأيت أن قد ضيع فرعاية الناس أشد. قال: فوافقه قولي فوضع رأسه ساعة ثم رفعه الي فقال: ان الله عزوجل يحفظ دينه واني لأن لااستخلف. قال: فوالله ماهو الا أن ذكر رسول الله ﷺ وابابكر فعلمت أنه لم يكن ليعدل برسول الله ﷺ أحداً وأنه غير مستخلف. رواه مسلم.

دابڕاون لە جیهانی دەرەوە، درۆیەکی شاخدارە و بێ ویژدانییە بۆ نووسەر کە ژنانی کۆمەڵگەی سعودیە بەو شێوەیە ئەخاتە بەرچاو، چونکە ئەمڕۆ بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و ئاسانکاری بۆ چوونە دەرەوەی وڵات هەموو ڕاستییەکان لەبەر چاون، کە وڵاتی سعودیە بە وڵاتی ژن ناوزەد دەکرێت، چونکە ئەو مافەی کە ژنان لەو وڵاتەدا هەیانە زۆربەی ژنی شوێنانی تر هەر لە خەویشدا نایبینێت، لە نووسەر وایە هەر بەوەی کە خۆیان نمایش ناکەن بۆ خەڵکی بێگانە و خۆیان ناکەنە بووکە شوشەی دەستی خەڵکانی نەفس نزم و بێ ڕەوشتی ئەم ڕۆژگارە، ئیتر لە خۆشییەکانی ژیان بێبەش دەبن..؟؟

گومان لەوە ناکرێت لە هەر کۆمەڵگایەکدا ژنان بە مافی خۆیان ڕازی ببن و ژیانێکی خۆش بەسەر بەرن، پەنا نابەنە بەر کۆڕ و سیمینار و وەدەرخستنی کارو چالاکییەکان بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان، لەبەر ئەوە دان بە بوون و وجودیان نراوە، هەر کار و چالاکییەك کە ئەنجامی دەدەن بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن، خۆ ئەگەر چەند حاڵەتێکی نەشازیش هەبێت، ئەوە بێویژدانییە تەعمیم بکرێت و ئەو حوکمە ناڕەواییەی نووسەری بۆ بدرێت..

پاشان نووسەر عورف و عاداتی کۆمەڵگاکانی لێ بووەتە دەقێکی ئیسلامیی، کە لە ڕاستیدا عادات و هەڵسوکەوتی هیچ وڵاتێك نابێتە دەقێکی ئایینی و کاری پێ بکرێت، بەڵکو پێویستە لە ڕوانگەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر ﷺ شتەکانی دەوروبەر هەڵبسەنگێرێت.

١٩ـ نووسەر لە لاپەڕە (١٣)دا ئاماژە بە وڵاتی پاکستان دەکات کە وڵاتێکی ئیسلامییە و ژنێك بۆ سەرۆك وەزیران هەڵدەبژێرێ، لە تورکیا ئافرەتێکی ئابووریزان دەبێتە سەرۆك وەزیران، لە جیاتی ئەوەی خۆیان ببەستنەوە بەو یاسایانەوە کە بەسەر ژنەکانی پێغەمبەردا سەپێنراوە، چاو لە دەوری ژنانێك دەکەن کە لە سەرەتایەکی زووتری مێژووی ئیسلامدا هەبوون، ژنی نموونە لای ئەم ژنە سەربازانە نوسەیبەیە کە یارمەتی ڕزگار کردنی گیانی موحەممەدی دا لە کاتێکدا زۆربەی زۆری سەربازانی پیاو ڕایان کرد، ئەم لە مەیدانی شەڕ لەگەڵ موحەممەد مایەوە.

له‌ وه‌ڵامی نووسه‌ردا ئه‌ڵێین: خۆزگه‌ ئه‌و ڕاستییانه‌ی كه‌ لایه‌تی وه‌ك خۆی بیگه‌یاندایه‌ و نه‌بوایه‌ته‌ داردەستی كه‌سێك یا لایه‌نێكی تر، ئه‌وه‌ته‌ هه‌ندێ جار به‌ قسه‌كانیدا وه‌ده‌رئه‌كه‌وێ كه‌ ئاگای له‌ مێژووی ڕاسته‌قینه‌ی ئیسلام هه‌یه‌، به‌ڵام كاریگه‌رێكی له‌سه‌ره‌ كه‌ چه‌واشه‌كاری خوێنه‌ران بكات و ڕاستییه‌كان بشێوێنێ، بۆ نموونه‌: له‌ لایه‌ك حیجاب ئه‌كاته‌ هۆكاری گۆشه‌گیر كردنی خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و ئافره‌تانی موسڵمان و له‌ لایه‌كی تر ڕۆڵ و كاریگه‌رییان ئه‌نرخێنێ له‌ بواری كاری سیاسی و سه‌ربازیدا، هه‌روه‌ك له‌ لاپه‌ڕه‌ (١٢٦)دا دان ئه‌نێت به‌ ڕۆڵی هه‌ره‌ گه‌وره‌ی ژنانی سه‌ره‌تای سه‌رده‌می ئیسلامی كه‌ نوسه‌یبه‌ی قاره‌مان به‌ نموونه‌ ئه‌هێنێته‌وه‌ كه‌ به‌شداری له‌ كارێكدا كردووه‌ كه‌ له‌ بنچینه‌دا كاری ئه‌و نه‌بووه‌، به‌ڵام كاتێ كه‌ زه‌رووره‌تی كار هاته‌ پێشه‌وه‌ نه‌به‌ردانه‌ چووه‌ پێشه‌وه‌ و ده‌بێته‌ جێگای شانازی بۆ هه‌موو ئافره‌تان و دڵخۆشی پێغه‌مبه‌ر و ﷺ وه‌سف و سه‌ناكردنی كه‌ له‌ غه‌زای ئوحوددا نووسه‌ر باسی لێوه‌ ده‌كات موحه‌ممه‌د فه‌رموویه‌تی: (لمقام نسیبه بنت كعب خیر من فلان وفلان)[103] واته‌: كار و ڕۆڵی نوسه‌یبه‌ی كچی كه‌عب ئه‌مڕۆ له‌ ڕۆڵی فلان و فلان چاكتر و باشتره‌، مه‌به‌ست له‌ فلان كه‌ هێناویه‌تی پیاوان بوون له‌ هاوه‌ڵان كه‌ به‌رگه‌ی شه‌ڕو ڕووداوه‌كه‌یان نه‌گرتووه‌.

یا ئوم عه‌تیه‌ی ئه‌نساری كه‌ به‌شداری حه‌وت شه‌ڕ و پێكدادانی كردووه‌ له‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ردا ﷺ[104] هه‌روه‌ها ره‌فیده‌ی ئه‌نساری كه‌ خاوه‌نی خه‌یمه‌یه‌ك بوو كاری برینپێچیی تێدا ئه‌نجام ده‌دا، له‌ شه‌ڕی خه‌نده‌قدا پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی با ره‌فیده‌ خه‌سته‌خانه‌كه‌ی بێنێته‌ ناو مزگه‌وته‌وه‌ تا برینداره‌كان ببرێته‌ لای بۆ چاره‌سه‌ری.[105]

---

[103] رواه البخاري والمسلم واحمد وابن ماجه.

[104] أسد الغابة (٥/ ٢٨٢).

[105] صحابيات حول الرسول (محمد راجى حسن كناس) ص- ٢٧٦.

بێگومان نموونەی قارەمانێتی ژنانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی ڕاشیدەین زۆرن و لە ژمارە نایەن[106] ، هەربۆیە ناتوانین لە دەرفەتێکی کورتی ئاوەهادا ڕۆڵ و کاریگەرییان بخەینە ڕوو، بەڵام یەك نموونە لە قارەمانێتی و فیداکاری ئەو ژنانە ئەوە ئەسەلمێنێ کە شان بەشانی پیاوان لە هەموو بوار و مەیدانێکدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە و جێی شانازی پیاوان و کۆمەڵگاکەشیان بوون و هیچ کاتیش ئیسلام گۆشەگیری نەکردوون و وەك کەسانی بێویژدان وێنای ئەگرن.

پاشان باس لە بەشداریی کردنی ژنانی موسڵمان ئەکات لە کاری سیاسیی و دەوڵەتدارییدا، کە خوا یاربێت لە شوێنی خۆیدا وەك پێویست باسی لێوە دەکەین، باسی خاتوو فاتمە ئەکات کە ڕابەرایەتی کاری سیاسیی کردووە پاش مردنی باوکی، دیارە ئەم قسەیەش هەڵبەستراو و دوور لە ڕاستییە، چونکە خاتوو فاتیمە رضي الله عنها پاش مردنی باوکی نەخۆش ئەکەوێت و بە هیچ کارێکەوە سەرقاڵ نابێت نەخۆشییەکەی نەبێ کە شەش مانگ ئەخایەنێت و پاشان بەرەو دونیای هەتا هەتایی ڕێ ئەگرێت، ئیتر ئەمە جگە لە پڕوپاگەندە بۆ شیعەگەرایی چی ترە؟!

کەواتە ئەتوانین لێرەدا بڵێین حیجاب ڕێگە لە ئازادی ناگرێت، نە ئازادی خوێندن نە ئازادی کارکردن، بەڵکو حیجاب پیاوان ناچار ئەکات کە کاتێك بۆ ئافرەت ئەڕوانن یا ئەیانەوێ مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، مامەڵە لەگەڵ عەقڵ و هۆش و کەسایەتی ئافرەتەکەدا بکەن، نەك لەگەڵ لەش و لار و شێوەیدا، بە پێچەوانەی ئافرەتی بێ حیجابەوە کە پیاوان زیاتر مامەڵە لەگەڵ جەستە و باڵای ئافرەتەکەدا ئەکەن، جا ئیتر قەبوڵی ئەکەن یان نا بێ گوێدانە هەست و هۆش و عەقڵی.. کێ بڕوا ناکات با ئامار و ریفراندۆم و توێژینەوە تازەکان بخوێنێتەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا.

بۆ نموونە: ژمارە (٥٤)ی گۆڤاری لڤین کە هەندێ ڕاستی ئەو بۆچوونەی باسکردووە لەوێدا لە بابەتی (ڤایرۆسی سێکس لە کایەی ڕۆشنبیری دەدات)، کە باس لە چیرۆکی ئیستغلالکردنی کچان لە دەزگا ڕۆشنبیرییەکاندا دەکات و دەڵێ: کچێکی ڕۆژنامەنووس

[106] بۆ نموونە بڕوانە: (صحابيات حول الرسول) ، اعداد : محمد راجي حسن كناس، هەروەها بڕوانە: (نساء حول الرسول) ، بقلم : محمود مهدي الاستانبولي ،مصطفى ابو النصر الشليي.

کە ناوی خۆی ئاشکرا نەکرد ئەڵێت: ئێستاش موچورکە بە گیانمدا دێت کاتێك کە بۆ ئەنجام گەیاندنی کارێکی ڕۆژنامەوانی ڕووم لە بەرپرسی کارەکەم کرد، ئەویش بە دەنگێکی گڕ وەڵامی دامەوە و وتی: ئەو کارەت بۆ ئەنجام ئەدەم، بە مەرجێ چێژ لەو جەستە ناسکەت وەرگرم. سەرنج بدەن خوێنەرانی ئازیز ئەگەر ئەو ئافرەتە بەو شێوازە خۆی ڕووت نەکاتەوە و جل و بەرگ و میکیاجێك بەکار نەهێنێت بۆ وروژاندنی ئارەزووی پیاوان، ئەو پیاوە چۆن ئەتوانێ ئەو هەڵوێستە لە بەرانبەریدا بنوێنێ؟

هەروەها شنۆ یەکێکی ترە لە قوربانییەکانی تری بێ حیجابی و تێکەڵاوی بێ سنوور، کە جلەکانی لە جلی کوڕێکی گەنجی شاری دەچوو، زیاتر لەوەی جلێکی کچانەیی بێت، دەیوت: دەمەوێت لە ڕوخسارم، لە جل و بەرگم، لە هەموو شتێکی تردا لە کچ نەچم، چونکە بێزم لە کچ بوونم دێتەوە.. لەم وڵاتەدا کچ چییە؟ جگە لە ئامرازێك بۆ دامرکاندنەوەی حەزی پیاوان.. شنۆ لەم بارەیەوە گەلێك چیرۆکی پڕ سوێی لایە و دەڵێت: جاری واهەبوو لەدەزگاکاندا کوڕێك کچێکی دەبردە ژوورەوە و دەرگای دادەخست و کەسیش بۆی نەبوو بڵێ ئەرێ کابرا خەریکی چیت؟

هەروەها ئەڵێت: وازهێنان و دەستلەکارکێشانەوەی من ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتانەی کە لێپرسراوی بەشەکەم ئامادەگی خۆیی دەردەخست بۆ گەورە کردنی ستۆدیۆکەم، بە مەرجێك ئەویش چی بوێت لەگەڵی بکەم، سەرەتا حاڵی نەبووم چی دەڵێت: بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە داوای جنسیم لێ دەکات! ئیتر پاش ئەوە بە تەواوەتی وازم لە کارەکەم هێنا.. ئەم چیرۆکە ناخۆشانە وا لە کچان دەکات کە لە دەزگاکانی تایبەت بە ژنان کار بکەن، هەروەك ڕێزانی ڕۆژنامەنووس ئاماژەی پێ دەکات، بە هۆی ئەو دیاردە ترسناکانەوە لە دەزگای ڕاگەیاندنی تایبەت بە ژنان کار دەکات.

سەیر بکەن لێرەدا چەند بە ڕوونی زیانی ئەو سفوری و تێکەڵییە بێ سنورە دێتە بەردەستمان و کچان بە ناچاری ڕوو لە کارێك دەکەن کە تایبەت بێت بە خۆیانەوە تا ڕووبەڕووی ئەو کارە قێزەونانە نەبنەوە.

٢٠ـ لە لاپەڕە (٢٦٠ – ٣٠٥)ی کتێبەکەی کە بەشێکە و تەرخانی کردووە بۆ دواندان سەبارەت بە گەڕانەوەی ئەو سەماکەر و هونەرمەندانەی کە بۆ یەکجاری دەستیان لە کارەکانیان کێشاوەتەوە و حیجابی ئیسلامییان پۆشیوە، هەروەها کەوتونەتە قسەکردن سەبارەت بە نەگریسی جیهانی هونەرمەندان و دەڵێن: ئەوەی لە بەهاری ١٩٩٢ی ز، روویدا هەرگیز بیری لێ نەدەکرایەوە کە: سەما و مۆسیقایەك شەوانی ڕەمەزانی گەرم ڕادەگرت وەك کارێکی غەیرە ئیسلامی قەدەغە کرا، بە سەدان هونەرمەندان ئەو کارەیان بێکار کرد، وەك شاژنی شانۆی قاهیرە سوهێر ئەلبابی و هەروەها هلە سافی و شەمس بارووودیو.. هتد. بە نموونە ئەیانهێنێتەوە کە: خۆخانەنشین کردنیان ئەکاتە هۆکارێکی گەڕانەوەیان بۆ لای ئیسلام و حیجابکردنە بەریان و ئەڵێت: بەدەست هەلگرتن و کشانەوەی هونەرمەندان لە کاری هونەری شێخە سعودییەکان بە هەزاران دۆلار ئەخەنە حیساب بانقەکانیانەوە، یا ئەڵێت: شێخە دەوڵەمەندەکانی سعودیە بە پارە لە ڕێگای زانای بەناوبانگی میسری شێخ موحەممەد موتەوەلی شەعراوییەوە ئەکڕدرێن و پارەیەکی زۆریان بۆ سەرف ئەکرێت کە ئەڵێت: بێگومان حیجابلەبەرانی تازە لەوە دەچوون پارەیەکی زۆریان هەبێت، بۆ نموونە: شەمس بارودی یەکەم کەس بوو لەوانەی حیجابی لەبەر کرد، بە سامانێکی زۆرەوە کەوتە کڕینی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمانەی کە تیایدا بە جلی تەنکەوە دەرکەوتبوو، بڕیاری دا هەرگیز فیلمەکانی لێ نەدرێتەوە.

کەچی لە هەمان کاتیشدا دێت قسەکانی هونەرمەند شەمس بارودی زۆر بە ڕوونی ئەخاتە ڕوو کە نە پیری[107] و نە پارە و مادە نەبوونەتە هۆکاری گەڕانەوە!!

خوێنەری بەڕێز ئەگەر کەمێك سەرنج بدەیتە قسە و بۆچوونەکانی نووسەر دژایەتییەك بەدی دەکەین کە نەدەبوو پاش بیستنی قسەکانی هونەرمەند ئەو بۆچوونانەی خۆی بڵاوبکردایەتەوە کە خۆی لە خۆیدا بە درۆخستنەوەی خۆیەتی و نەمانی متمانەشە بەو هۆکارانەی کە ئەیخاتە پاڵ هونەرمەندانی تر.. بێگومان هونەرمەندی تەوبەکار لە چەندین چاوپێکەوتندا ئیدانەی هەر لێدوانێکی کرد

[107] شەمسولبارودی هەر بە گەنجی گەڕایەوە و تەوبەی کرد.

**سەبارەت بە سەرچاوەی ئەو پارانەی کە فلیمەکانی پێ دەکرێتەوە، بە تایبەت زانای بەناوبانگ (موحەممەد موتەوەلی شەعراوی) کە نووسەر چەندین جار ئاماژە بە ناوەکەی دەکات.**

**هەروەها هۆکاری گەڕانەوە و تەوبەکردنەکەی و پۆشینی حیجابەکەشی ئەگێڕێتەوە بۆ یەکەم سەفەرەی عەمرەی و تێکەڵاوی کردنی لەگەڵ ئەو ئافرەتە باڵاپۆشانەی کە لە وڵاتانی ترەوە هاتبوون، پۆشینی حیجابەکەی دانابوو بە سەلماندنی بەندایەتی خۆی بەرانبەر بە خوای خۆی، ئاشکرایە کەسێکیش گەڕایەوە بۆ لای خوا و وازی لە کارێکیش هێنا کە مایەی نیگەرانی بێت بۆی، هەمیشە هەوڵ دەدات بیسڕێتەوە و لەپێش چاوی خەڵك ونی بکات، بە شێواز و ئاکارێکی جوانتر و چاکتر خۆی نیشان بدات، ئیتر کەی پێویست ئەکات ئەو هەموو پڕوپاگەندەی درۆی شاخداری ناو کۆڕ و کۆمەڵی سینەماکان بکرێتە بەڵگە و خەڵکی پێ چەواشە بکرێت!!**

**باشە ئەو ئەستێرە سینەماییانەی هونەر کوا وا بێپارەن تا خەڵکیی بپرسێ: ئەو پارانەی لە کوێ بوو؟ ئەو پارانەی بەرهەمی ئەو هەموو هونەرەیە کە نوواندویەتی! ئیتر کەی سەیرە پارەدار بێت؟! بەو پارانەی مافی بڵاوکردنەوەی فیلمەکانی خۆی بکڕێتەوە؟ خۆ ئەم کاروانی گەڕانەوەیە بەرەو دین تەنیا لە ناو هونەرمەندان‌دا نییە تا وەرگێڕ و نووسەری بێویژدان قەتیسی بکەن لە ئافرەت و پارە و ئەو شتانەدا، ئەی ئەو هەموو زانا و خوێندەوارەی تر لەبەر چی ئەگەڕێنەوە بۆ ئایین. بۆ نموونە:**

**١ـ هۆجان لارسۆن**[١٠٨] **کە نووسەری بەناوبانگی وڵاتی سویدە و خاوەنی حەڤدە کتێبە لە بوارەکانی فەلسەفە و مێژوو چیرۆکدا، دیارە موسڵمانان بوونی ئەم نووسەرە هەروا عاتفی نەبووە و خێرا خۆی بدات بە دەستەوە، بەڵکو پاش چەندین ساڵ لە توێژینەوە و گفتوگۆ سەبارەت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام؟ سەرەتای موسڵمان بوونی ئەم نووسەرە لە کۆڕێکەوە دەست پێدەکات کە کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیرانی موسڵمان لە وڵاتی سویددا گرتیان و چەندین موحازەڕەیان سەبارەت بە ئیسلام و ڕەهەدەکانی پێشکەش بە ئامادەبوان کرد، لێرەوە هۆجان چەندەها پرسیار و تێبینی لە لا گەڵاڵە**

[108] گۆڤاری بانگی حەق ژمارە ٢٣ی زستانی ٢٠٠٧

بوو، هەر بۆیە کەوتە پرسیار کردن و موداخەلە لەگەڵ سەرۆکی کۆڕەکە، پاش ئەوە پەیوەندییەکەیان وای لێهات بەردەوام تەلەفون کردن لە نێوانیاندا هەبوو بۆ ڕەوینەوەی ئەو گرفت و تێبینییانەی کە بۆی دروست بوو بوو، سەرەنجام لەبەردەم سەرۆکی کۆڕی ڕۆشنبیران کە دکتۆر عەدلی حیجر بوو موسڵمان بوونی خۆی دەربڕی و بە هەردوو زمانی سویدی و عەرەبی دانی نا بە هەردوو شەهادەتی (أشهد أن لااله الاالله وأشهد أن محمداً رسول الله).

**٢- روجیە گارودی**[109]، فەیلەسوفی گەورەی فەڕەنسی کە لە ڕۆژانی بازاڕگەرمی کۆمۆنیستیدا بەرپرسی یەکەمی بزاڤەکانی سۆسیالیزم بوو لە فەڕەنسادا، بەشداریی شەڕەکانی فەڕەنسای کردووە و دژ بە گەلی موسڵمانی جەزائیری لە یەکێك لەو بەشدارییانەیدا بەدیل دەگیرێت پاش ئەوەی فەرماندەی ئەو دەستەیەی ئەم بە دیلی ئەگرن فەرمان بە سەربازێکی عادەتی ئەکات گوللەبارانی ئەم بکەن، بەڵام ئەو سەربازە نکوڵی لەوە دەکات و ئەڵێ ئەمە دیلە و بێ چەکە و ئیسلام ڕێگە نادات بیکوژم، روجیە گارودیش لەو حیوار و گفتوگۆیەی نێوانیان سەری سووڕدەمێنێ و بڕیار ئەدات لە دڵی خۆیدا کە گەڕایەوە بۆ فەڕەنسا دەست بکات بە توێژینەوەیەکی جددیی لەسەر ئیسلام و ئەم ئاواتەشی دێتە دی و توێژینەوەیەکی ورد ئەکات لەسەر ئیسلام و بۆی دەرئەکەوێت کە ئیسلام ئەو ڕێباز و بەرنامە پێویستەیە کە ئەم لە زووەوە بە شوێنیدا ئەگەڕێت وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ ئەم بەرنامە فیکرییانەی کە ئێستا لە ئارادان..

رۆجیە گارودی پێش ئەم توێژینەوەیە کتێبێکی بە ناوی (البدیل) نووسی کە تێیدا لە ئاسۆدا بۆ ئەو بەرنامە تێروتەسەلە ئەگەڕێت بیکاتە (منطلق) بۆ بیروڕاکانی و وەك پێوەرێك موحاکەماتی لەسەر بکات.

روجیە گارودی لە ساڵی (١٩٨٢)دا ئیسلامبوونی خۆی ڕائەگەیەنێت و دەست ئەکاتە ناساندنی ئەو میتۆد و بنەمایانەی کە دایناوە بۆ بەرقەرارکردنی ژیانێکی پڕ

[109] بڕوانە کتێبی (روجیە گارودی) (حکایة ألرجل الذي هدّ الصهیونیە) ی د. یحی ألفریطی.

بەختەوەری و ناوی خۆی لە (رۆجیە)وە ئەگۆڕێت بە (موحەممەد ڕەجا)و دوای ئەوە ئیتر هەر بە (ڕەجا گارودی) ئەناسرێت..

رۆجیە گارودی چەندین کتێبی لەسەر ئیسلام و ئابووری ئیسلامی و مێژووی ئیسلامی نووسیوە لەوانە (الإسلام دين المستقبل)، (الإسلام وأزمة الغرب)ء چەندین توێژینەوەی تری لەسەر ئاینەکانی تر کردووە و لە یەکێك لە کتێبەکانیدا بە ناوی (الخرافات المؤسسة للسياسة الأسرائيلية)، کە لەسەر جولەکە و ستەم و داگیرکارییان لە فەڵەستیندا نووسیویەتی و تێیدا ئەوە ئەسەلمێنێ کە ئەفسانەی (هۆلۆکۆس) هیچ بناغەیەکی نییە و درۆ و گزیبازییە کە جولەکە بۆ چەواشە کردنی دنیا دایان هێناوە. . شایانی باسە لەسەر ئەو کتێبە دەسەڵاتی فەڕەنسی زیندانی ئەکەن و غەرامەیەکی دارایی زۆریشی لێ دەسێنن.

رۆجیە گارودی لە ساڵی ١٩٥٣ زاینیدا بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سۆربۆن بەدەست هێناوە و لە ساڵی ١٩٥٤ زاینیشدا لە مۆسکۆ بڕوانامەیەکی تری دکتۆرا بەدەست دێنێت، لە ساڵی ١٩٧٠دا سەنتەری توێژینەوەی مارکسیزم دروست دەکات، لە حیلەکانەوە دەستی بە نووسینی فیکری کردووە و چەندین کتێبی نووسیوە وەك (النظرية المادية في المعرفة)، (لحرية)، (أسئلة سارتر)، (البنيوية)، (فلسفة موت الإنسان)، (منعطف الإشتراكية اكبير)، (ماركسية قرن العشرين) و.... هتد. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦٩ لەسەر ئەو جۆرە نووسینانە لێی کەوتنە تەقە و بە بڕیارێك لە ساڵی (١٩٧٠)دا لە حزبی شیوعی فەڕەنسی دەریان کرد، دروست پاش نووسینی کتێبی بەناوبانگی (حوار الحضارات)ەکەی.

رۆجیە گارودی سێ قۆناغ بەسەریدا تێپەڕیوە: قۆناغی مادییەت و دنیاگەری کە پێڕەوی لە فیکری مارکسیزمی ئەکرد و کەوتە ڕیفۆرم لەو فیکرەیەیشدا، پاش قۆناغی گومان و دوودڵی کە تێیدا کتێبی (البديل)ی تێدا نووسی.

قۆناغی ئیسلامەتی کە تێیدا بە قەناعەت و لە ئاستێکی فیکری بەرزدا ئیسلام وەك ئەو ئەڵتەرناتیڤە ڕاستە ڤینەیە هەڵدەبژێرێت کە بە ئایینی داهاتووی ئەزانێ بۆ هەموو بەشەر و دوای ئەوە ئیتر ململانێی ڕاستەڤینەی لەگەڵ گاور و جولەکەدا بۆ

دروست ئەبێ و بەو کتێبی (الخرافات المؤسسة للسياسة الأسرائيلية) ئەکەوێتە ناو قۆناغێکی تازەی ژیانییەوە کە بریتییە لە بانگخوازێك بۆ ئیسلام و مافی ئیسلامیی میللەتانی ئەم ناوچەیە..

باشە موسڵمان بوونی فەیلەسوفێکی وەك گارودی جگە لە گەورەیی ئیسلام و بەرزی تەعالیماتەکانی بەڵگەی چی ترە؟ دەی هەر ئەمەیە واش ئەکات لە ئەستێرەکانی سینەما بگەڕێنەوە بۆ لای دین، چونکە لە ڕاستیدا دین و شتێکی لاوەکی نییە لە ژیاندا ببێ، خراپ نییە و نەبێت خراپ نییە، دین شتێکی جەوهەرییە لە ژیانیدا، وەك ئاو و هەوا و خواردن پێویستە بۆ مرۆڤ، خۆ ئەگەر دین دونیایەکی کامەران و جوانیش وەك پێویست دروست نەکات بۆ مرۆڤەکانی، ئەوە بە دڵنیاییەوە ئاخیرەتێکی پڕ کامەرانی و جوانی دروست ئەکات و مرۆڤ لەو جیهانەدا جگە لە ناسنامەی دینی ڕاستەقینە هیچی تری لێ قەبووڵ ناکرێت.. وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (آل عمران: ٨٥) واتە: هەرکەس شوێن جگە لە ئیسلامەتی بکەوێ لێی قەبووڵ ناکرێت و لە ئاخیرەتیشدا ئەبێتە کەسێکی ڕەنج بەخەسارە!!

**٣- ڤالنتین برۆساکۆڤ**[110] ئەم پرۆفیسۆرە مامۆستای زانکۆی ڕووسیی لە بنەماڵەیەکی جولەکە هاتۆتە دونیاوە، دوای ئەوەی کە خۆشحاڵ نەبووە بە شیوعیەت سەفەر ئەکات بۆ ئەمریکا و بۆ ماوەی بیست ساڵ لەوێ ژیان ئەباتە سەر، پاش توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لەسەر ئیسلام و ئایینەکانی تر، خوای گەورە دڵی بە نووری ئیسلام ڕووناك ئەکاتەوە، ناوبراو خاوەنی چەندین کتێبە و بە یەکێك لە نووسەرە گەورەکانی ڕووسیا دادەنرێت.

شایانی باسە ئەم پرۆفیسۆرە کاتێك کە لە ئەمریکا بووە مامۆستای (کوندا لیزا ڕایس)ی وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا بووە، لە کتێبێکی نوێیدا بە ناوی (سەفەرم بەرەو ئیمان) باس لە ئەزموونی خۆی لەگەڵ شیوعیەت و دیموکراسی ڕۆژئاوا و هۆکارەکانی بوون بە موسڵمانی دەکات.

[110] سایتی هەواڵ لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

ئێمە ئەو سێ کەسایەتییەمان تەنیا بۆ نموونە هێنایەوە و هەرکەس زانیاری زیاتری ئەوێ با کتێبی (الغرب نحو الدرب) بخوێنێتەوە تا لەوە بگات موسڵمان بوون یان چی؟!

٢٠ـ نووسەر لە لاپەڕە (١٧)دا سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە حیجاب دەپۆشن، چونکە ئەو حیجابە وابەستەیان ئەکات بە یاسا و ڕێسایەك کە ئیتر دەنگی ئەو لە دادگادا بە نیوەی دەنگی پیاو حساب بکرێ، لە میرات دابەشکردندا بەشی ئەو نیوەی بەشی براکەی بێت، لە ژیانی ژن و مێردایەتی دا هەرکات گوێڕایەڵ نەبوو، لە لایەن مێردەکەیەوە دارکاری بکرێ، بەشداری حەزی مێردەکەی بکات بۆ مارەکردنی سێ ژنی تر، هەرکات مێردەکەی پێی باش بوو تەڵاقی بدا و لە بەخێوکردنی منداڵەکانی بێبەشی بکات.[111]

لە وەڵامی نووسەردا دەڵێین: پۆشینی حیجاب فەرمانێکی ئاینییە، ئایین وەك بەرنامەی خوا بۆ ژیانی بەندەکانی خوا، پێش لە دیاری کردنی هەر ئەرك و ماف و شێوەیەك لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەوڵ دەدات ڕۆحییەتێك لە مرۆڤدا بخولقێنێ کە هەستی مرۆڤایەتی لەبەرچاوگرتنی ڕێزی بەرانبەر تەنها لە روانگەی مرۆڤایەتی بوونەکەیەوە زاڵ بکات بەسەر بیرکردنەوە و هەر مامەڵەکردنێکی لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا، دوای ئەوە لە ڕوانگەی لەبەرچاوگرتنی سروشت و پێویستییەکانی هەر ڕەگەزێك یاخود هەر تاکێکەوە بە شێوەیەکی گشتی ماف و ئەرکەکانی بۆ هەر تاکێك دیاری کردووە.

جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئیسلام و بیر و باوەڕەکانی تردا هەیە و پیاوانی کایەی یاساش دان بەمەدا ئەنێن ئەویش ئەوەیە، یاسا واقیع ناخولقێنی، بەڵکو واقیع یاسا ئەخولقێنێ، بەڵام لە ئیسلامدا شتەکە پێچەوانەیە، پێش ئەوەی بارێکی نائاسایی بخولقێ، ئیسلام یاسایەك دائەنێ بۆ ئەوەی ئەو بارە نالەبارە ڕوو نەدات کە خەڵکیی تووشی تەنگەژە نەبن.. جا ئەگەر ئاینێك بەم شێوەیە بێت، دەبێ کێ بتوانێ ڕەخنەیەکی لێ بگرێ کە قەناعەتی پێ بکرێ و جێگای باوەڕ پێکردنی خەڵکی بێت؟

[111] لاپەڕە (١٧) ی کتێبی (کچانی خوا)

لەڕاستیدا کاتێك بیروڕای زانستیانەی شوێنی بڕوا دەبێ و بە کارێکی مەنتیقی زانستیانە دادەنرێ کە بە بەڵگەی دروست و ئەوتۆ بەرپەرچی ئەو بیروڕایانەی بدرێتەوە کە کەس نەتوانێ قبوڵی نەکا و دانی پێدا نەنێ..

نووسەر ژمارەیەکی زۆر ڕەخنەی لە ئیسلام گرتووە و خەڵکیی ئەترسێنێ لە ئیسلام، جا ئێمەش بە پشتیوانی خوای گەورە وەڵامی هەریەکە لەو ڕەخنانەی دەدەینەوە کە ئەو شتانە بوونەتە یاسا و بابای نووسەر بە ستەمێك دژ بە چین و توێژی ئافرەتان ناوزەدی ئەکات.

# یەکەم: ئافرەت و شایەتیدان:

بێگومان یەکێك لەو مەسەلانەی بووەتە ئیشکال و تێڕامانی هەندێك لە خەڵکانی بێ ئاگا لە ئایین و بەرنامەی ئیسلام شایەتیدانی ئافرەتە لە سەرجەم بوارەکانی ژیان دا...

سەرەتا دەڵێین ئەو ئایەتەی کە ئاماژە بە شایەتیدانی ئافرەت دەکات ئایەتی (٢٨٢) لە سورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: (وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى) واتە: شایەتی بگرن دوو شایەت لە پیاوانی خۆتان، خۆ ئەگەر دوو شایەت دەست نەکەوت بۆ شایەتییەکە (فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) با پیاوێك و دوو ئافرەت بێت (مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء) لەو کەسانەی کەڕازین لێیان‌و پەسەندیان دەکەن... هەر لە ئایەتەکەدا خوای گەورە هۆکەی ڕوون ئەکاتەوە کە بۆچی دوو ئافرەت دابنرێ لە جیاتی پیاوەکەی تر (أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا) نەوەك یەکێکیان ڕووداوەکانی لە یاد بچێ و نەتوانێ بە تەواوی بیڵێت (فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى) ئەوی تریان یادی بخاتەوە و بە هەردووکیانەوە بتوانن شایەتییەکە وەك خۆی بگەیەنن، چونکە بە هۆی سروشتی دروست بوونییەوە ئافرەت سۆز و عاتیفەی گەلێك لە پیاوان بەهێزترە و ڕووداوەکان خێراتر کاری تێدەکات و پەرچەکداری خێرایە و شپرزی و شڵەژاوی ڕووی تێدەکات بە شێوەیەك کە نەتوانێ

بە تەواوی ڕووداوەکان هەڵگریٚ و بیگێڕێتەوە، خۆ ئەگەر بشتوانیٚ و زاڵ ببێت بەسەر ڕووداوەکەدا و بێتە دادگا و بەرانبەر بە تاوانبار بوەستێنریٚ شایەتی لە دەم وەربگیریٚ بۆ ئەوەی تۆڵەی لەسەر دیاری بکرێت کوشتن بیٚ یا زیندانی یا... هتد.

ئەو یەکسەر سۆزە دایکایەتییەکەی دەجووڵیٚ و ناتوانیٚ تەنها یەك پیت بدرکێنیٚ، یاخود بە شێوەیەك شایەتییەکە دەدات کە تاوانباری پیٚ ڕزگار ببێت، بۆیە لەم کاتانەدا پێویستی بەوە هەیە کە ئافرەتێکی تر لەگەڵیدا بێت بۆ یادخستنەوەی یا بۆ حەزەرێك کە نەتوانیٚ لەبەر ئەو ئافرەتەی تر کەم و زیادی لە شایەتییەکەیدا دروست بکات.

لێرەدا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە بوونی دوو ئافرەت لەو حاڵەتانەدا زەرورەتی کارەکەیە و پێویستە بەو شێوەیە بێت، ئەگینا مافەکان لە بەین دەچن، هیچ شورەییەکیش نییە ئەگەر یادخەرەوەیەك هەبێت.

لەوانەیە لێرەدا پرسیارێك بێتە کایەوە کە بۆچی ئافرەت یادی بچێتەوە و پیاوان مچبوگ بن تێیدا؟ دەڵێین لەڕاستیدا سروشتی کارەکەی وای کردووە کە بەو شێوەیە بێت، هەر کەسێك پیاو بێت یا ئافرەت بە هەر کارێکەوە خەریك و سەرگەرم بوو، ئەوا کارەکەی زۆر مەبەستە و لەو بوارەدا بەهرەمەندە، بەڵام ئەبینی لەو بوارەی خۆیدا کە شارەزایە ئایینی ئیسلام شایەتی بە تەنها لە دەم وەردەگریٚ، یا ئافرەتێك بەرانبەر بە دوو پیاوە لەسەر کچێتی، کچێك یا لەسەر بوونی منداڵ یا لەسەر ژیانی منداڵێك لە کاتی بوونیدا، بۆ نموونە ئەگەر منالێك لەدایك بوو مردبوو، ئەو منداڵە باوکی مردبیٚ و میراتی لیٚ بەجیٚ مابیٚ، ئەوا ئەو ئافرەتە مامانە ئەهێنریٚ و پرسیاری منالەکەی لیٚ دەکریٚ، کە ئایا ئەو منداڵە بە مردوویی لە دایك بوو یا بە زیندوویی و پاش بوونەکەی مرد، جا ئەو ئافرەتە مامانە هەر قسەیەکی کرد، ئەوا ئەو قسەیە وەردەگیریٚ و بەس.

کەواتە ئەسڵ لە شایەتیدانددا پاراستنی مافەکانە و هیچ پەیوەندییەکی بە نرخ و ڕێز و کەسایەتییەوە نییە و لە زۆر بواردا تەنها شایەتی ئافرەت قبوڵ دەکرێت، هەروەها لە مەسەلەی شیرپێداندا ئەوپەڕی ئیعتبار دادەنریٚ بۆ شایەتی یەك ئافرەت، بە

شێوەیەك دەبێتە مایەی جیابوونەوەی ژن و مێرد لە یەکتری، ئەگەر منداڵیش لە نێوانیاندا هەبوو، لە کاتێکدا ئافرەتێك شایەتی دا کە بە منداڵیی شیریان پێکەوە خواردووە.. لە ئایینی ئیسلامدا و بە بۆچوونی زۆربەی زانایان لە شایەتیدا تەنها شایەتی کەسێکی (عدل) دەم ڕاست وەردەگیرێ، خۆ ئەگەر ناچاریی هاتە پێشەوە، ئەوا شەش شایەتی ناعادل بەرانبەر بە یەك شایەتی (عدل) دەبێت.

دیارە مەسەلەی شایەتیدان لە ئیسلامدا بنیات نراوە لەسەر واقیع و تایبەتمەندێتی، واتە ژمارە و جۆری شایەتەکان دەگۆڕدرێت بەپێی ڕووداوەکان، وەك جینایەتی گەورە یا مەسەلەی پارە و پووڵ و بازرگانی یا نیکاح و ڕەچەڵەك (نسب) یا هەندێ مەسائل کە تەنها و تەنها شایەتیی ئافرەت قبوڵە، حاڵەتی منداڵ بوون بە مردوویی‌و حاڵەتی زیناکردن کە چوار شایەتی دەوێ، یا مەسەلەی (لعان)[112] کە شایەتییەك ئافرەت بەرانبەر بەشایەتییەك پیاوە وەك لەسورەتی (نور)دا هاتووە. . کەواتە مەبەست لەشایەتی دان اپبات کردنی ڕاستییەکانە، تا مافی هیچ کەس نەفەوتێ‌و ستەمکارو ستەملێکراو بە مافی خۆیان بگەن.

ئاشکرایە کە لەئایینی ئیسلامدا مەسەلەکان‌و شاهێدەکان پۆلێن کراوون‌و حسابی تایبەتمەندێتی کراوە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لو يعطي الناس بدعواهم لادعى ناس وماء رجال وأهوالهم) واتە: ئەگەر بەپێی (ادعاء)ی خەڵك بکرێ‌و لێکۆڵینەوە (اثبات) نەبێ ئەوا خوێن‌و ماڵییەکتر حەڵاڵ دەکەن.. کەواتە لەشایەتی داندا حسابی ڕووکەش‌و ڕۆتین ناکرێ و مەسەلەکە پلە یەك‌و پلە دوو نییە و فەزڵی پیاو و ژن نییە بەسەر یەکتر یەوە.. لەم چەند دەستەواژەیەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەکۆی چەندین حاڵەت تەنیا یەك حاڵەت هەیە کە شایەتی دوو ئافرەت بە بەرانبەر پیاوەێکەوە دانراوە ئەویش لەبەر تایبەتمەندی و پسپۆڕیە،

[112] بریتییە لەوەی پیاوێك چوار جار سوێند بخوات لەسەر ژنەکەی کە زینای کردووە و بۆ جاری پێنجەمیش بڵێت نەفرەتی خوام لێ بێ گەر درۆ بکەم بەمەش قوتار و سەرفەراز دەبێت لە سزای تاوانبار کردنی ژنەکەی بێ بەڵگە، هەروەها ژنەکەی چوار جار سوێند بخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات و پێنجەم جاریش بڵێت نەفرەتی خوام لێ بێت گەر درۆ بکەم بەمەش قوتار دەبێت لە سزای زیناو داوێن پیسی.

کەچی لەچەندین حاڵەتی تردا کەلەو حاڵەتە زۆر ترسناکتر و پڕ گرنگترە، شایەتی ئافرەت وەك شایەتی پیاو وایەو لەچەند حاڵەتی تردا شایەتییەك ئافرەت بە بەرانبەر زیاد لە پیاوێکەوە ئەوەستێ دەی کەوا بێ ئەم بێویژدانییەی نووسەر لە پای چی کە ئافرەتان هان ئەدات لە ئیسلام و پێیان ئەڵێت: ئەگەر وابەستە ببن بە ئیسلامەوە ئیتر لە دادگاکاندا دەنگتان بە نیوەی دەنگی پیاوان حساب دەکرێ !!

# دووەم: ئافرەت و میراتی:

خوای گەورە ئەفەرموێ: (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيماً)[١١٣].

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە دابەزینی ئایەتەکانی قورئان بەپێی کات و سەردەم و پێداویستی مرۆڤەکان دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ و لەوێشەوە گەیەنراوە و حوکمی مرۆڤەکانی پێ کراوە، ئەو داب و نەریتە نامۆیانەی کەفیترەتی مرۆڤەکان ناخوات هەڵوەشێنراونەتەوە و ڕێگریی لێکراوە.. بۆ نموونە: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە لە سورەتی نیسائدا هاتووە ئەم فەرمووەدەیەیە کە خێزانی سەعدی کوڕی ڕەبیع بە هەردوو کچەکەیەوە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە هەردوو کچەکەی سەعدە و باوکیان لە غەزای (ئوحود)دا شەهید بوو، ئێستا مامەکەیان هەرچی ماڵەکەیانە بردویێتی و هیچی بۆ بەجێ نەهێشتوون، ناشخوازرێن ئەگەر ماڵیان نەبێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوا خۆی بڕیار ئەدات و ئەم مەسەلەیە ئەبڕێنێتەوە، ئەوە بوو پاش کەمێك ئایەتی میرات دابەزییە سەر پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ) واتە:

113 سورة النساء الأية (١١)

خوا ئامۆژگاریتان ئەکات و ڕاتان ئەسپێرێ بەرانبەر بە منداڵەکانتان، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێن مامەکەیاندا تا دوو لەسەر سێی ماڵەکە بدات بە دوو کچەکە و هەشت یەکی بداتە دایکەکە و ئەوەشی کە مایەوە بۆ خۆی[١١٤]، واتە مامەکەیان، لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە بەر لەوەی ئایەتی میرات دابەزێت ڕەگەزی ژن هیچ حسابێکی بۆ نەکراوە و لە ماڵی مێرد یا باوك بێبەش کراوە تەنانەت وەك کاڵایەك بە میرات کراوە، چ پیاوێك لە خزمە نزیکەکانی پیاوەکەی خێراتر پێی بگەیشتایە کراسێکی ئەدا بەسەریدا، ئیتر بۆی هەبوو خۆی بیخوازێت بەبێ دیاری کردنی مارەیی، یا بیدات بەشوو بە کەسێکی تر و مارەییەکەی بۆ خۆی بێت، تا خوای گەورە ئەو یاسایەی هەڵوەشاندەوە و ئافرەتی لەو بێ دەسەلاتییە ڕزگار کرد بەم ئایاتە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً)[١١٥]. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ڕەوا نییە بۆتان ئەو ژنانەی کە مێردەکانیان دەمرن بە میرات بگرن و بە زۆر زەوتیان بکەن.

هەروەها لە ئایەتێکی تری سورەتی نیسائدا ئەفەرموێ: (لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيباً مَّفْرُوضاً) (النساء: ٧) واتە: بۆ پیاوان هەیە بەش لەو میراتەی کە دایك و باوك و خزمە نزیکەکان بەجێی دەهێڵن، هەروەها بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەو میراتەی کە دایك و باوك و خزمە نزیکەکانی بەجێی دەهێڵن، ئیتر ئەو میراتە کەم بێت یا زۆر بەشێکە و خوا بڕیاری لەسەر داوە.

جا لێرەدا دێینە سەر ئەسڵی مەسەلەکە بە ڕاڤەکردنی ئایەتەکە کە ئایەتی میراتە و لە سەرەتادا خستمانە ڕوو:

---

[114] روي أن امرأة (سعد بن الربيع) جاءت رسول الله ﷺ ببنتيها فقالت: يارسول الله هاتان ابنتان سعد بن الربيع قتل أبوهما سعد معك بأحدا شهيداً، وان عمهما أخذ مالهما فلم يدع لهما مالاً، ولا تنكحان الا بمال فقال ﷺ: يقضي الله في ذلك، فنزلت أية المواريث (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ) فارسل رسول الله ﷺ الى عمهما أن اعطي ابنتي سعد الثلثين وأمهما الثمن وما بقى فهو لك) رواه ابو داود والترمذي.

[115] سورة النساء الاية (١٩)

(يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ) خوای گەورە خۆی فەرمانتان پێ ئەکات بەوەی کە عادل و سەرڕاست بن لەگەڵ منداڵەکانتاندا (کوڕ و کچ) لە کاتی میرات دابەش کردندا (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ) بۆ هەر کوڕێك لەو ماڵە بەشی دوو کچ دەبات.

(إِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ) خۆ ئەگەر ئافرەتەکان دوان یا زیاتر بوون (فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ) ئەوا دوو سێ یەکی ماڵەکەیان پێ دەدرێت، واتە دوو لەسەر سێی میراتەکە (وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ) ئەگەر تەنها یەك کچی لێ بەجێ مابوو، ئەوا یەك لەسەر دووی میراتەکەی پێدەدرێ، لەبەر ئەوەی منداڵ زیاتر پێویستی بە ماڵی باوکەو خوای گەورە لەپێش کەسەکانی تر وەك باوك و دایك و خوشك و برا لەبەر چاوی گرتوون.

(وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ) وە بۆ هەریەکە لە دایك و باوك یەك لەسەر شەشی ئەو میراتەیان بەر ئەکەوێت، ئەگەر مردووەکە منداڵی لێ بەجێ مابوو کەواتە لەم حاڵەتەدا ژن و پیاو وەك یەك لە ماڵی میراتیان بەر ئەکەوێت (فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ) خۆ ئەگەر مردووەکە منداڵی لێ بەجێ نەمابوو، هەر دایك و باوکی میراتگری بوون ئەوا (فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ) بۆ دایکەکە یەك لەسەر سێی ماڵی میراتەکەیە و ئەوی تریشی کە مایەوە ئەدرێتە باوك (فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ)، بەڵام ئەگەر مردووەکە کە خوشك و برای لێ بەجێ مابوو ئەوا دایکەکە یەك لەسەر شەشی ماڵی میراتی کوڕەکەی دەکەوێ و ماوەکەی دەدرێتە باوك، چونکە بژێوی منداڵەکانی تری و ژنەکەشی هەر لەسەر باوکەکەیە (مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ) لەسەر کەس و کاری مردووەکەیە بەر لە دابەشکردنی میراتەکە وەسیەت و قەرزی مردووەکە ببژێرن (آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ) باوکەکان و کوڕەکانتان نازانن کامەیان نزیکترن بۆ سوود پێگەیاندنتان، ئەم دابەش کردنەش لە لایەن خواوەیە و پێویستە ڕەچاو بکرێت (إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيماً) دیارە خوای گەورە زانایە بەسەر دروستکراوەکانیدا چی لە بەرژەوەندییانە و کاربەجێیە لەوەی ئەیکاتە یاسا و فەرزی ئەکات لەسەر مرۆڤەکان، پاشان خوای گەورە باسی میراتی ژن و مێرد دەکات و دەفەرموێ: (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ

أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ) واتە: ئەی پیاوان نیوەی ئەو ماڵی میراتەی کە لە ژنەکانتان بەجێ ئەمێنێ بۆ ئێوەیە بە مەرجێ منداڵی لێتان نەبێت و لە غەیری ئێوەش منداڵی نەبێ (فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ) خۆ ئەگەر منداڵی هەبوو لێتان یا لە غەیری خۆتان ئەوا یەك لەسەر چواری ماڵی میراتەکەی بۆ ئێوەیە (مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ) پاش جێبەجێ کردنی سپاردەو دانەوەی قەرزەکانیان. (وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ) وە بۆ ژنەکانتان یەك لەسەر چواری ئەو ماڵی میراتەیان ئەکەوێ بە مەرجێ منداڵیان نەبێ لێتان، یا لە غەیری ئەو منداڵتان نەبێت (فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم) خۆ ئەگەر منداڵیان لێتان بوو، یا لە غەیری ئەو منداڵی ترتان بوو ئەوا یەك لەسەر هەشتی ماڵی میراتەکەیان پێدەدرێت. (مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ) پاش بەجێ هێنانی سپاردە و بژاردنی قەرزەکانیان، خوای گەورە چەند جارێك ئەم ئایەتە دووبارە ئەکاتەوە بۆ ئەوەی زۆر گرنگی بدرێت پێیان (وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ) ئەگەر پیاوێك یا ژنێك بمرێت و کەسێکی نزیکی لێ بەجێ نەمێنێ وەك منداڵ و دایك و باوك، خوشك و برای دایك و باوکی پێی ئەوترێ (کلالە)، بەڵام (وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ) لە دایکیانەوە خوشك و برای هەبوو ئەوا یەك لەسەر شەشی ماڵی میراتەکەیان پێدەدرێ، خۆ ئەگەر زیاتر بوون لە یەك خوشك و برا، ئەوا بەهەر هەموویانەوە بەشدار ئەبن لە یەك لەسەر سێی ماڵەکەدا بە یەکسانی و لێرەدا جیاوازی لە نێوان کوڕ و کچەکاندا ناکرێت (مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ) ئەم میراتەش کاتێك ئەدرێتە خوشك و برای دایکی یا خزمە دوورەکانی پاش وەسیەت و بژاردنی قەرزەکانی، بە مەرجێ وەسیەتەکە بە شێوەیەك نەبێت زیان بە میراتگرەکان بگەیەنێ، واتە زۆرینەی ماڵەکەی بەخشیبێ (وَصِيَّةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ) دیارە ئەم دابەش کردنی ماڵی میراتییە لە لایەن خوای گەورەوەیە و مەبەست پێی پاراستنی ئابووری نێوان مرۆڤەکانە و خوا خۆی زانا و کاربەجێ و کارجوانە.

**كەواتە لێرەدا ئەتوانین بڵێین بە نووسەر کە ئایینی ئیسلام بەرنامەیەکی گشتگیرە و باس لە هەموو وردەکارییەکانی ژیان دەکات و بەرنامەڕێژی بۆ کردووە، میراتیش بەندێکە لە بەندەکانی یاسای ئیسلام و تاکە تاکەی کۆمەڵگای لەو بوارەدا فەرامۆش نەکردووە بەتایبەت چین و توێژی ئافرەتان، ئەو گلەیی و گازندەیەش کە ئەکرێ سەبارەت بەوەی ئافرەت نیوەی پیاو دەبات، خۆ ئەگەر تەنها ئەوە مافی بوایە و حسابێکی تری بۆ نەکرایە ئەو کاتە جێی گلەیی بوو.. بەڵام لێرەدا بەپێی تایبەتمەندێتی و ئەرك و کاری هەریەکەیان میراتییەکە دابەش کراوە، کاتێك پیاوێك دوو ئەوەندەی خوشکەکەی دەبات، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەرکی سەر شانییەتی بژێوی ماڵ و منداڵ و لەوانەیە خوشکەکەشی لەسەر شان بێت، یاخود ئەگەر کوڕ بێت ئەوا ئەرکی ژنهێنان و پێویستەکانی ئەکەوێتە ئەستۆ، بەڵام بە پێچەوانەوە لە دینی خوادا ئافرەتان لەسەریان نییە تەنها یەك دینار خەرج بکەن، تەنانەت بۆ بژێوی خۆیشیان مەگەر خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی خۆیانی لەسەر بێت، ئەو میراتەش کە وەری دەگرێت خۆی ئازادە چی لێدەکات ئەیخوات، ئەیخاتە بازرگانیەوە، ئەیبەخشێتەوە، ئەیکات بە خێر، ئەیکات بە ئاڵتوون و ئەیدات لە خۆی... هتد. کەواتە خوای گەورە هەر ویستی وابووە بێبەشی نەکات، ئەگینا وەك خۆی بۆی ئەمێنێتەوە ئەگەر سەرنج بدەین لێرەدا ئەبینین میراتی ئافرەتەکە زیاترە لە پیاوەکە، بەڵام یەکسانی ژن و پیاو لە وەرگرتنی میراتیدا لە وڵاتی ڕۆژئاوا لەسەر پڕەنسیبی بژێوییەکەیە، کە ئافرەتان بژێوییان لەسەر خۆیانە بە هەر وەسیلەیەك بێت، ئەگەرنا ئەبێ بمرن لە برسانا، (من لا یعمل لا یأکل)، خۆ ئەگەر وەسیلەکەش پەنا بردن بێت بۆ هەر کارێکی خراپو ناشایستە.**

**بۆ نموونە: نووسەری کتێبی (الإسلام وحاجة الإنسانیة الیە) موحەممەد یوسف (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە کاتێکدا باس لە گرنگیدانی ئیسلام ئەکات بە خێزان بە تایبەت ئافرەت و نموونەیەکی بەرچاو بینراوی خۆی ئەگێڕێتەوە کە چووەتە فەڕەنسا و لە ماڵێکی ناسیاویدا ماوەتەوە، پاش چەند ڕۆژێك و ورد بوونەوەی لە ئافرەتە ئیشکەرەکەیان و هەڵسەنگاندنی ئەپرسێت لە خاوەن ماڵەکە و ئەڵێت**

هەرچی سەیری ئەم ئافرەتە ئیشکەرە ئەکەم زۆر بەرێز و خانەدان دێتە بەرچاوم.. خاوەن ماڵەکەش بەڕاستی وەڵامی ئەداتەوە کە ئەم ئافرەتە لە خێزانێکی چاکی ئەم وڵاتەن و مامێکی زۆر دەوڵەمەند و سەروەتمەندیشی هەیە بەبێ ئەوەی لەم ئافرەتە بپرسێتەوە و گرنگی پێبدات.

میوانەکەش ئەڵێت: ئەی باشە بۆچی لە دادگا شکاتی لێناکات تا بژێوی بۆ ببڕێتەوە؟ خاوەن ماڵەکەش زۆر بە سەرسوڕمانەوە وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێت: شتی وەها لە یاسای ئێرەدا نییە، پاشان پرسیاری لێ دەکات بۆچی، شتی وەها ئەبێت؟ میوانەکەش ئەڵێت: کاتێك کە منیش باسی یاسای ئیسلام و مافی بژێوی ئافرەتانم کرد لە سەر باوك و برا و مێردە، خۆ ئەگەر ئەمانەشی نەبوو ئەوا مام و خاڵ و... هتد. خاوەن ماڵەکەش وتی: ئێمە لە کوێ و ئەو یاسایە لە کوێ!

بەڕاستی ئەگەر شتی وەها لە یاسای ئێرەدا ببوایە ئەوا تاکە ئافرەتێکت نەدەبینی بچوایەتە دەرەوە بە نیازی کارکردن لە هیچ دام و دەزگا و کارگەیەکدا، بەڵکو ئێستا ڕۆیشتنیان لە ترسی برسێتی و تیاچوونە نەك بە ویست و ئارەزووی خۆیان..

کەواتە دیاری کردنی دوو ئەوەندەی ماڵی میراتی بۆ پیاوان لەم حاڵەتەدا هەر بە سوودی ئافرەتانە و لەپێناو ئەواندا خەرج ئەکرێتەوە بە زیادیشەوە، لە چەند حاڵەتی تردا وەك لە ڕاڤەی ئایەتەکەوە بۆمان ڕوون بوویەوە بەشی ئافرەتان هێندەی بەشی پیاوانە (وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ) (..وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ...) (النساء: ١٢) ئەم یەکسانییە لە میراتدا لە زۆر حاڵەتدا بەدی دەکرێ و لای خەڵکانی پسپۆڕ لەو بوارەدا ئاشکرایە، هەندێ حاڵەتی تریش هەیە کە بەشی ئافرەتان زیاترە لە بەشی پیاوان (فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ) لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئافرەتێك مردو میراتگرەکەی مێردی و باوك و دایکی بوو، ئەوا مێردەکەی نیوەی دەبات و دایکەکەی یەك لەسەر سێی دەبات و باوکەکەش یەك لەسەر شەشی دەبات، بە کورتی ئایەتەکانی میرات بەشکردن سیاسەتێکی ئابوورییە و پەیوەندی نییە بە ژنێتی یان پیاوێتی مرۆڤەوە، بەڵکو پەیوەندی بە باری

بەرژەوەندی مرۆڤەکانەوە هەیە، دادو بەرژەوەندی ئافرەت داخواستی لە پیاو زیاتر ئەبات، خۆ ئەگەر داد وای خواست وەك ئەو ئەبات و حاڵەتی واش هەیە کەمتر لە پیاو ئەبات، چونکە هەلومەرجەکان وائەخوازن...

ئەتوانین بڵێین دابەشکردنی ماڵی میراتی بەو شێوەیە لە سوود و بەختەوەری هەموانە بەتایبەت بە ئافرەتان. هەروەك نووسەر خۆی لە لاپەڕە (٢٥١)دا ئاماژە بەوە دەکات کە لە سەدەی حەوتەمدا ڕێسای میراتی بازدانێکی زۆر گەورە بوو بۆ بەرەو پێش چوونی ئافرەتان..

ئیتر ئەوە نەزانییە یان بێویژدانییەکە کەسێك ئاگای لە هەموو حاڵەتەکانی دابەش کردنی میراتی نییە و لە خۆیەوە ئەیگرێت بە تەنیا حاڵەتێکەوە و ئەڵێ: ئافرەت نیوەی پیاو ئەبات و نازانێ ئەم سیاسەتی دابەش کردنی میراتە نزیکەی (٣٠) حاڵەتە و تەنیا چەند حاڵەتێکی کەمیان ئافرەت نیوەی پیاو ئەبات حاڵەتەکانی تر یان بەقەدەر پیاو ئەبات یان زیاد لەپیاو ئەبات، بەڵکو حاڵەتی واهەیە نیوەی هەموو ماڵەکە ئەدرێتە ئافرەتێك و چی پیاوی تر هەیە ئەبنە شەریك لە نیوەکەی تردا.

سێیەم: ئافرەت و یاخی بوونی لە مێرد (المرأة الناشذة)، پێش هەموو قسەیەك با ئەوە بڵێین خوای گەورە وەك چۆن باسی ئافرەتی ناشیزەی کردووە لە قورئاندا، هەرواش باسی پیاوی (ناشِز)ی کردووە، خۆ ئەگەر بتوانین بە وردی توێژینەوەیەك دەربارەی ئەم ئیسلامە بکەین ئەو کاتە گەورەیی خوا و گشتگیری بەرنامەکەیمان بۆ دەردەکەوێت کە تەنها شتێك نییە پەیوەند بێت بە ژیانی مرۆڤەکانەوە باسی لێوە نەکرابێت و ڕێ و شوێنی بۆ نەگیرابێتە بەر، بێگومان مەسەلەی یاخی بوونی ئافرەت لە مێرد و کێشمەکێشمی نێوانیان یەکێکە لەو گرفتانەی کە خوای گەورە لە ئایەتی (٣٤)ی سورەتی نیسائدا باسی دەکات و پلە بە پلە ڕێگای چارەسەر نیشان مێردەکان دەدات تا بتوانن زۆر بە حەکیمانە زاڵ ببن بەسەر هەر گرفتێك کە لەگەڵ خێزانەکانیاندا دروست دەبێت. خوای گەورە نەفسیەت و دەروونی ئافرەتەکانی لەبەر چاو گرتووە کە هەر کۆمەڵێك لە ئافرەتان بە شێوازێك کار و مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێت، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (..وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ

وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً) (النساء: ٣٤)، سەرەتا ڕووی خیتابی ئایەتەکە لە پیاوانە و ئەفەرموێ: ئەگەر ترستان بوو لەوەی کە خێزانەکانتان بەرەو یاخی بوون و پشت هەڵکردن دەڕۆن و ئەبنە مایەی ئاژاوە و ناکۆکی و نیگەرانی لە ماڵەکانتاندا، ئەوا هەوڵ بدەن ڕێگای چاکسازی بگرنە بەر لەگەڵیاندا.. سەرەتا بە (فعظوهن) ئامۆژگارییان بکەن، چاك و خراپی ئەو یاخی بوونەیان بخەنە بەرچاو، پاشان لە تووڕەیی و خەشمی خوا بیان ترسێنن، خۆ ئەگەر باش بوون و گەڕانەوە سەر دۆخی جارانیان ئەوا زۆر چاکە و بۆتان نییە ڕێگایەکی تر بگرنە بەر لەگەڵیاندا، بەڵام ئەگەر هەروەك خۆیان مانەوەو گوێیان بۆ نەگرتن ئەوا ڕێگای دووەم بگرنەبەر (وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ) جێگایان لێ جوێ بکەنەوە و دەنگیان لێوەربگرن و نزیکیان مەکەونەوە، لێرەدا ئیبن عەباس ئەفەرموێ: مەبەست لە جێگا لێ جوێ کردنەوە، ئەوەیە لەگەڵیاندا مەخەون، بەڵام هەر لەسەر هەمان جێگای پێشووی خۆتان بن، بەڵام پشتیان لێ هەڵکەن[116]. مەبەستی پێی ئەوەیە کە ماڵ بەجێ نەهێڵێ و ژووری لێ جیا نەکاتەوە، کە ئەوەندەی تر لێکیان دوور بخاتەوە، ئەگەر لەم حاڵەتەشدا هەر نەگۆڕاو بێ باك بوو لە هەر ڕووداوێك کە ڕوویدات، ئەوا ڕێگای سێهەم ئەگرێتە بەر بە (واضربوهن)، وشەی (واضربوهن) تەفسیری جۆراو جۆری بۆ کراوە لە لایەن موفەسیرانەوە، کە هەریەکە بەپێی شوێن و جێگای لە ئایەتەکاندا مانایەکی جیا ئەبەخشێ. خۆ ئەگەر تەماشای تەفسیرەکانی قورئان بکەین هەر هەموویان یەك مانایان بۆ ئەم وشەیە کردووە کە (لێدانە) و ئەڵێن: (اضربوهن) لێیان بدەن لێدانێکی بێ ئازاری جەستەیی، بەڵکو لێدانێك وەك دەست بەرز کردنەوەیەك لێی کە نەفسییەتی پێی بشکێ و کێشەکەیان بەرەو خراپتر سەر نەکێشێت، بەڵام لە کتێبی (ضرب المرأة وسيلة الخلافات الزوجية)ی دکتۆر عبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان دا (اضربوهن) واتای لێدان و دارکاری ناگەیەنێ بەڵکو مانای تۆران و ماڵ جێهێڵان ئەگەیەنێ و ئەیسەلمێنێ کە لە هیچ

[116] قال ابن عباس: (الهجر ألا يجامعها وأن يضاجعها على فراشها ويوليها ظهره) مختصر إبن كثير (١/ ٣٨٦)

ئایەتێكدا (ضرب) بۆ لێدان بەكار نەهاتووە، بەڵكو ئەگەر مەبەستی لێدان بێت ئەوا وشەی (جلد)ی بۆ دەربڕینی مانای لێدان بەكار هێناوە، سیرەتی پێغەمبەری ﷺ هێناوە لە كاتی ناشیزە بوونی خێزانەكانیدا بۆ ماوەی یەك مانگ ماڵەكانیان بەجێ دەهێڵێ و ڕوو لە (مەشرەبە)[117] دەكات و لەوێ دەمێنێتەوە تا خێزانەكانی بە خۆیاندا ئەچنەوە و پەشیمانیی دەر دەبڕن لەسەر ئەو پێداگری و یاخی بوونەی كە نواندیان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، كەواتە (واضربوهن) مانای لێدانی بگەیاندایە ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێش هەموو كەسێكەوە بەم فەرمانە هەڵئەستا، بەڵام لێرەدا بۆمان دەرئەكەوێت كە وشەی (واضربوهن) لە لای پێغەمبەر ﷺ پشگوێ خستن و خۆ عاجز كردن و دوور كەوتنەوە لەماڵ ئەگەیەنێ. هیچ فەرموودەیەك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیان نەداوە بە لێدان و داركاری كردنی ژن، بەڵكو لۆمە و سەرزەنشتی پیاوانێك دەكات كە پەنا دەبەنە بەر لێدان بەرانبەر ژنە كانیان و هەروەك پێغەمبەر ﷺ جارێكیان تووڕە ئەبێ لەو كەسەی كە لە خێزانەكەی خۆی داوە و ئەفەرموێ: (لیظیل أحدكم لیضرب امرأته ضرب العبد ثم یظیل یعانقها ولا یستحي)، هەروەها لە فەرموودەیەكی تردا ئەفەرموێ (لاتضربوا إماء اللّه)..

با بێینەوە سەر باسەكەی خۆمان كە باسی قۆناغی سێهەممان كرد كە (واضربوهن) بوو، لێكدانەوەكەی دكتۆر عەبدولحەمید زۆر جوانتر و لەپێشترە بۆ ماناكردنی قۆناغی سێهەم كە با پیاوان بتۆرێن و ماڵەكانیان بەجێ بهێڵن، بۆ ئەوەی ئەو خێزانە لە مۆتەكەی تەڵاق و جیابوونەوە بپارێزرێت (فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً) خۆ ئەگەر بە یەكێك لەو قۆناغانە چاك بوو، بیری كردەوە و كۆڵی دا لەو شەڕ و ئاژاوە و ناكۆكی و یاخی بوونەی، ئەوا بۆتان نییە هیچ ڕێگایەكی تر بگرنە بەر بەرانبەریان و ئازاریان بدەن، چونكە (إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً) واتە: بزانن كە خوای گەورە زۆر لە ئێوەی پیاوان بە دەسەڵاتتر و بەهێزترە، لەو حاڵەتەدا خوا خاوەنی ئەوانە و تۆڵەش لە كەسانێك ئەكاتەوە كە ستەمیان لێ بكات.

[117] شوێنێكە لە لای مەدینە.

حا سەرنج بدە کە چۆن خوای گەورە پیاوان فێری مامەڵەکردن ئەکات لە کاتی کێشە و ئاژاوەیان لەگەڵ ژنەکانیاندا و لە هەمان کاتیشدا هەڕەشە لە پیاوان ئەکات کە کارێك نەکەن مایەی ئازار و ستەم بێت بەرانبەریان.

ئەو لێدانەش کە نووسەر پێناسەی بۆ ئەکات و ئەیکاتە یەکێك لەو ڕمە ژەهراوییانەی کە بە خەیاڵی خۆی ئیسلامی پێ ناشیرین دەکات و دەڵێت: هەرکات ژن گوێڕایەڵ نەبوو لە لایەن مێردەکەیەوە دارکاری بکرێت، وانییە، بەڵکو بەو شێوەیەی سەرەوەیە کە باسمان لێوە کرد و تەنها مەبەستیش لە بەجێهێنانی قۆناغەکانی یەك لە دوای یەك لە لایەن پیاوانەوە بە شێوەیەکی دروست تا بە ئاسانی شیرازەی خێزانەکان تێك نەچێت و کۆمەڵێك منداڵی جوانیش سەرگەردان نەبن و دوور لە سۆز و میهر و هێلانەی دایك و باوکەوە پەروەردە ببن.

# چوارەم: تەڵاق لە ئیسلام:

ئیسلام ئاینێکی واقعییە، دارشتن و دانانی یاساکانی منیزەت و دروست بوونی مرۆڤەکانە، کە جۆرەها بیر و بۆچوون و هەڵوێستی جیا جیایان لێ ئەوەشێتەوە، لە هەمان کاتیشدا پێویستی بە ڕێگەچارە ئەبێت، هەروەها پێکەوەنانی خێزان و کۆکردنەوەی ژن و مێرد لە ماڵێکدا گەورەترین ئامانجی لە پشتەوەیە کە خستنەوەی نەوەو پاراستنی ڕەچەڵەك و درێژەدانە بە ژیان، بەڵام ئەگەر لە حاڵەتێکیشدا ئەو ژن و مێردە نەگونجان و بەرخوردیان بەرانبەر بەیەك نابەجێ و ناشایستە بوو، ڕێزی بەرانبەر لای یەك نەما و هێلانەی خێزانییان بوویە بەشێك لە دۆزەخ، ئەوا بە تێپەڕاندنی ئەو قۆناغانەی کە لە پێشەوە باسمان کرد (آخر الدواء الكي) کۆتا دەرمان کە سووتاندنە واتە تەڵاق و جیابوونەوە بەکار دەهێنری بۆیان و لە یەکتر جیا دەکرێنەوە.

دیارە مەرج نییە هەموو تەڵاقدانێك باش و لەبار بێت، بەڵکو لەوانەیە ئەوەندە نالەبار و خراپ بێت کە سەر بکێشێ بۆ حەرام، چونکە خێزانێك بە تەواوی

**هەڵئەوەشێتەوە کە ئیسلام زۆر گرنگی پێداوە، هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ دەربارەی ئەفەرموێ: (ابغض الحلال الی الله الطلاق)[118] واتە: بوغزاوترین حەڵاڵ لە لای خوا تەڵاقە، کەواتە بۆ کاتی زۆر پێویست نەبێت تەڵاق بەکارناهێنرێت، کە حاڵەتەکە حاڵەتێکی ناچاری بێت بۆ ژن و مێردەکە، هەروەك ئەڵێن: (ان من أعظم البلايا معاشرة من لايوافقك ولا يفارقك) واتە: گەورەترین بەڵاو موسیبەت ئەوەیە کە لەگەڵ کەسێکدا بژیت ڕێك نەکەوێت و نەگونجێ لەگەڵتا و نەشتوانی لێی جیا ببیتەوە، ئەی ئەگەر ئەو کەسە ژنەکە بێت یا پیاوەکە کە هەمیشە هاوەڵ و هاوسەرت بێت لە ژیاندا؟ ئەبێ چۆن ژیانێك بێت کە بەسەرببرێت!! هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە تەڵاقی کردۆتە یاسا و لەهەمان کاتیشدا بە کارێکی نەشتەرگەری و دەرمانێکی تاڵ دەدرێتە قەڵەم واتە بەرگەی ئازار بگرێ تا بەشەکانی تری جەستە پارێزراو بێت.**

**جا پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئیسلام بەر لە پێکهێنانی خێزان کۆمەڵێك مەرجی لە نێوان ئەو دوو خێزانەدا داناوە، تا دروست کردن و بیناکردنی ئەو خێزانە لەسەر بنچینە و بنەمایەکی پتەو و بێ گیروگرفت بێت، وەك:**

**١ـ لە کاتی هەڵبژاردنی ئافرەتێك بۆ هاوسەری ژیان، دین و ڕەوشتی لەبەرچاو بگیرێ بەر لەماڵ و سامان و شان و شەوکەت و جوانی، هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ: (تنكح المرأة لأربع: لمالها، ولحسبها ولجمالها، ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك[119]). لێرەدا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئەگەر خاوەنی ئەو سیفەتانەی تر بێت و دین و ڕەوشتی لاواز بێت ئەوا خێر ناداتەوە، یاخود لەوانەیە ئەو سیفەتانەی تر بە هۆی ڕۆژگار و نەهامەتییەکانییەوە لە ناو بچن و نەمێنن، بەڵام ڕەوشت و دینەکەی هەر بەردەوام ئەبێت و قەرەبووی زۆر لایەنی سلبی ئەکاتەوە بۆ خێزانەکەی.**

**٢ـ بینینی ئەو ئافرەتە بەر لە مارەبڕین، بۆ ئەوەی دڵی دابمەزرێ لەسەری تا پەیوەندی نێوانیان بەردەوام بێت، هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ بەو**

---

[118] رواه ابو داود (٢١٧٨) عن ابن عمر .

[119] متفق عليه عن أبى هريرة، اللؤلؤ والمرجان (٩٢٨).

**كەسانەی كە بە نیازی پرۆسەی هاوسەرگیرین: (اذهب فانظر اليحا فانه أحرى أن يؤدم بينكما [120]). ئەم بینین و تەماشاكردنەش تا سێ جار بۆی هەیە دووبارەی بكاتەوە، بۆیە لەم حاڵەتەدا زیاتر پیاوی لەبەر چاو گرتووە، چونكە زیاتر پیاو بە بیانووە تا ئافرەت و پیاو ڕووكەش و فۆرمی ئافرەت سەرنجی ڕادەكێشێ بە پێچەوانەی ئافرەتەوە كە جەوهەر و كەسایەتی پیاو سەرسامی ئەكات زیاد لە فۆڕم و ڕووی دەرەوە.**

**٣- گرنگیدانی ئافرەتەكە و كەسوكاری بە هەڵبژاردنی كوڕێكی چاكی بەڕەوشت و ديندار هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ: (اذا آتاكم من ترضون دينه و خلقه فزوجوه) واتە: ئەگەر كەسێك هاتە خوازبێنی كچەكانتان، لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا بیاندەنێ، پێشینانی صاڵحی ئێمەش وتویانە: (إذا زوجت ابنتك فزوّجها دين وان أحبها اكرمها، وان كرهها لم يظلمها). واتە: ئەگەر كچەكەتت دا بە شوو، ئەوا بە كەسێكی دینداری بدە، ئەگەر خۆشی ویست ئەوا ڕێزی دەگرێت، خۆ ئەگەر خۆشیشی نەویست ئەوە ستەمی لێ ناكات.**

**٤- بە هەندوەرگرتنی ڕەزامەندی ئافرەتەكە لە كاتی بەشوودانیدا و بە هیچ شێوەیەك دروست نییە بدرێت بە كەسێك كە ئارەزووی لێی نەبێت، پێغەمبەر ﷺ بە گژی كەسانێكدا چووە كە بە زۆر كچەكانیان بە شوو داوە بەبێ ڕەزامەندییان.**

(عن عباس: أن جارية بكراً النبي ﷺ ذكرت أن أباها زوجها وهي كارهة، فخيرها النبي ﷺ [121]). **واتە: ئیبن عەباس ئەگێڕێتەوە كە كچێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو كە باوكی داوێتی بە شوو بەبێ ئەوەی پێی خۆش بێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئیختیاری دایە دەست كچەكە، كە بە شوودانەكەی لەسەر ڕەزامەندی ئەو دەبێت، واتە كچەكە.**

[120] رواه أحمد والدارقطني والحاكم والبيهقي عن أنس، وأحمد وابن ماجه الدارقطني والطبراني والبيهقي عن المغيرة، انظر: صحيح الجامع الصغير وزيادته (٨٥٩).

[121] رواه ابو داود .

(عن خنساء بنت خدام الأنصارية: أن أباها زوجها وهي ثيب فكرهت ذلك فأتت رسول الله ﷺ فرد نكاحه[122]) واتە: خەنسای کچی خەدامی ئەنساری کە بێوەژن بوو، باوکی بە شووی دابوو، بەڵام خەنسا ناڕازی بوو، بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەر و کارەکەی پێ ڕاگەیاند، پێغەمبەریش ﷺ نیکاحەکەی هەڵوەشاندەوە.

٥- لەبەرچاوگرتنی ڕەزامەندی کەسوکاری کچەکە، چونکە ناڕەزاییان ئەبێتە هۆی جیابوونەوە و پچڕانیان لە یەکتر، ئەگەر نا کار ئەکاتە سەر ژیانی خێزانیان.

٦- بەهەندوەرگرتنی ڕەزامەندی دایکی کچان، بۆ ئەوەی پرۆسەی بە تێروتەسەلی بچێتە پێشەوە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەفەرموێ: (امروا النساء في بناهضن).

٧- ڕاهێنان و ئامۆژگاری کردنی پیاوەکە بەوەی کە واقعی بێت لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا، بە چاوی بێ عەیب نەڕوانێتە ژنەکەی، بەڵکو چۆن چاوەڕوانی شتی چاك و بەرخوردی جوان ئەکات، بەهەمان شێوە چاوەڕێی کارانێکیش بێت کە مایەی نیگەرانی بێت بۆی، هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: (لايفركن (لايبغضن) مؤمن مؤمنة ان كره منها خلقاً، رضي منها غيره[123]). واتە: با هیچ پیاوێکی ئیماندار ڕق و کینە لە خێزانە ئیماندارەکەی هەڵنەگرێت، گەر بێزار بوو لە لایەنێکی خۆ لە لایەنەکانی تری ڕازییە، جا سەرنج بدە کە چۆن پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر ﷺ هاوسەنگی لە نێوان ژن و مێرد و مرۆڤەکاندا دروست دەکات.

٨- بەئاگاهێنانەوەی هەردووکیان لەسەر ئەو ئەرك و مافانەی کە بەرانبەر یەکتر هەیانە، هەریەکەیان بەرپرسن بەرانبەر بە ئەرکەکانیان، پاشان بۆیان هەیە داوای مافەکانیان بکەن لە یەکتر، هەروەك خوای گەورە لە ئایەتی (٢٢٨)ی سوورەتی بەقەرەدا ئەفەرموێ: (وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ) واتە: ئەوانیش (ئافرەتەکان) مافیان هەیە بەسەرتانەوە، هەر چۆن ئێوە مافتان هەیە بە سەریانەوە، یا (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ) بە هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵیاندا مامەڵە بکەن.

[122] رواه البخاري .

[123] رواه مسلم عن أبي هريرة .

٩- ئامۆژگاری کردنی ڕەگەزی پیاو بەوەی کە بەر لەوەی کێشەیان بەرەو گەورە بوون بڕوات چەند قۆناغێك بگرنە بەر لەگەڵ خێزانەکانیاندا. (وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً). [١٢٤]

١٠- دایك و باوك ئامادەییان هەبێت لە چارەسەری گرفت و کێشەی منداڵەکانیان واتە کاتێك کچێك ئەداتە شوو یاخود ژن بۆ کوڕەکەی دەهێنێ هەر چاوەڕوانی خۆشییان لێ نەکات، بەڵکو کێشە و گرفتیش شتێکی چاوەڕوانکراو ئەبێت، بەڵام لێرەدا گرنگ ئەوەیە کێشەکان بە ژیرانە چارەسەر بکەن، نەك ببنە لایەنێکی نیگەتیف و کێشەکە بەرەو خراپتر بەرن، بێگومان هەر خانەوادەیەك ئەو خاڵانەی سەرەوەی لەبەرچاو گرت ئەوا کێشە خێزانییەکان کەم ئەبنەوە و ڕێژەی تەڵاقیش کە ئەمڕۆ لە بەرزبوونەوەدایە زۆر کەم ئەبێتەوە و ئەبێتە دیاردەیەکی دەگمەن لە کۆمەڵگادا.

دیارە کەوتنی تەڵاق هەروا ئاسان نییە، بەڵکو مەرج و ڕێ و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، نەك بە بۆچوونی نووسەر هەرکاتێك پیاو بیەوێ ژنەکەی تەڵاق دەدات، نەخێر ئەگەر پیاوێك پارێزگاری لە دین و کەسایەتی ئیسلامیی خۆی بکات پێویستە پارێزگاری لە یاساکانی خوا بکات و ڕەزامەندی خوای لەلا گرنگتر بێت تا بەرژەوەندی تەسکی خۆی.

# کەی و چۆن تەڵاق دەکەوێت؟

خوای گەورە ئەو بەرنامەڕێژییەی دا بە گوێی پیاوانێکدا کە لەگەڵ خێزانەکانیاندا کێشە و گرفت هەیە بیگرنەبەر تا بە ژیرانە گرفتەکان چارە بکەن و سەر نەکێشێ بۆ

124 (النساء: ٣٤).

جیابوونەوە و تەڵاق، خۆ ئەگەر ئەو ڕێگاچارانە سودێکی نەبوو، ئەوا فەرمان ئەکرێت بە کەس و کاری ژن و مێردەکە بچنە ناو کێشەکەوە و دانیشتنێکی خێزانییان بۆ پێك بهێنن، بە مەرجێ ئەو دانیشتنە کەسانی دەم ڕاست و متمانە پێکرا و بن لە هەردوو لا بۆ ئەوەی بتوانن چاکسازی بکەن، نەك بەرەو خراپتر و لێك هەڵوەشانی بەرن، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا). [125] واتە: ئەگەر گومانتان برد و زانیتان کە نێوان ئەو ژن و پیاوە بەرەو لێکترازان و دوورکەوتنەوە ئەڕوات، ئەوا با ئەو دوو کەسە دەم ڕاستە لە خزمانی هەردووکیان بکەونە بەین بۆ ئەوەی کێشە و گرفتەکان چارە بکەن و بچووکیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر ئەو دوو (حەکەمە) ناوبژیوانە نییەتیان چاکەو چاکسازی بوو، ئەوا ئاشتەوایی و خۆشەویستی و لێك نزیك بوونەوە لە نێوان ژن و پیاوەکەدا دروست دەبێت [126]، بەڵام هەندێکی تر ئەڵێن مەبەستی (إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا) بۆ ژن و پیاوەکەیە کە ئەگەر هەردووکیان نییەتیان چاك و ئاشتی بێت ئەوا خوای گەورە یارمەتییان دەدات و لێکیان نزیك ئەخاتەوە، بە هەرحاڵ هەرکام لە ڕاڤەکان بێت، گرنگ ئەوەیە کە بە وشەی (فابعثوا) فەرمان ئەکات بە گرنگی ئەو جەلەسە خێزانییە تا شیرازەی خانەوادەکان نەپچڕێت.

بەڵگە نەویستە کە بە یاساکردنی تەڵاق بۆ هەموو کەس و کاتێك نییە کە بە ڕەهایی هەرکەس بیەوێ پێی هەڵسێت و ئەنجامی بدات، بەڵکو ئەو تەڵاقەی کە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیان پێداوە و بە تەڵاقێکی شەرعی و زەرووری دائەنێن ئەوەیە کە: پێویستە پیاوەکە کاتێکی دیاری کراوی گونجاو هەڵبژێرێ بۆ تەڵاقدان و جیابوونەوە لە ژنەکەی، واتە لە کاتی بێنوێژی (حیض) ژنەکەیدا نابێ تەڵاقەکە

[125] سورەتی نیساء ئایەتی (٣٥).

[126] ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتی (إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا) لەسەر زاری ئیبن عەباس و موجاهید و هەندێکی تره. تەفسیری قورتووبی، ج٣.

بخات، یا لە کاتی پاکێتی ژنەکەیدا و چووبێتە لاشی هەر بۆی نییە ئەو تەڵاقە بخات[127].

خۆ ئەگەر لەو دوو کاتەدا تەڵاقی خوارد بە نییەتی جیابوونەوە لە ژنەکەی ئەوا بە بۆچوونی هەندێ لە زانایان ئەو تەڵاقە ناکەوێت، لەبەر ئەوە لەکاتێکدا بووە کە پێچەوانە بووە لەگەڵ شەریعەتی خوا و پێغەمبەردا ﷺ وەك لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فنهو ردٌ)[128].

هەروەها پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە تەڵاقەکە ئەخات لە بارودۆخێکی ئاساییدا بێت و چاك ئاگای لەخۆی بێت، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو واتە: ئەگەر هۆشی بە لای خۆیەوە نەبوو بە هەر وەسیلەیەك بێت یا لە کاتی هەڵچوون و توڕەییدا بێت یا بە زۆر پێی بکرێت ئەوا دیسان ئەو تەڵاقە ناکەوێ هەروەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (لا طلق في اغلاق)[129] وشەی (اغلاق) واتە تووڕەیی بەپێی ڕاڤەی ئەبو داود، بەڵام بێجگە لە ئەبو داود بە (زۆر لێکردن) ڕاڤەیان بۆ کردووە و هەردووکیشیان هەر ڕاستن.

هەروەها ئەو کەسەی کە تەڵاقەکە ئەخوات پێویستە نییەت و نیازی تەواوی هەبێت لە جیابوونەوەی ژنەکەی، بەڵام ئەگەر تەنها مەبەستی سوێند پێخواردنی بێت یا ترساندنی ژنەکەی بێت دیسان هەر ناکەوێت بە بۆچوون و ڕەئی هەندێ لە زانایانی پێشوو و ئیبن قەییم و ئیبن تەیمیەش ئەو بۆچوونەیان پشتڕاست کردۆتەوە.

بەڵام ئەگەر پیاوەکە دیراسەیەکی تەواوی تەڵاقەکەی کردو بە تاکە چارەی زانی بۆ ڕزگار بوونی لە ژیانێك کە لە توانایدا نەماوە، ئەو کاتە نییەتەکەی ساغ ئەبێتەوە و

---

127 روای البخاري أن عبداللّه بن عمر طلق امرأة وهى حائض، فزكر ذلك عمر الرسول الله ﷺ فتفيظ رسول الله ثم قال: ليرا جعها ثم يمسكها حتى تطهر، ثم تحيض فتطر، فان بدا له ان يطلقها فليطلقها طاهراً قبل أن يمسها فتلك العدة التي أخر بها اللّه عز وجل. اخرجه البخاري والمسلم .

128 رواه مسلم برقم (١٧١٨) عن عائشة (رضي الله عنه).

129 رواه ابو داود برقم (٢١٩٣) ، وإبن ماجه برقم (٢٠٤٦) عن عائشة.

**تەڵاقەکەی لێوەرئەگیرێ (انما الطلاق عن وطر) واتە: بێگومان کەوتن و خستنی تەڵاق بە خواست و ئارەزووی تەڵاقدەرەکەیە و نابێ زۆری لێبکرێت.**

**دیارە کە (ابغض الحلال عندالله الطلاق) بۆ کاتی زەرورەتە و کۆمەڵێك سنووری بۆ دیاری کراوە لە پیادەکردنیدا کە لە سەرەتاوە باسمان کرد، لە هەمان کاتیشدا پێویستە بە پێی ئایەتەکە (الطلاق مرتان) بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ بێت، واتە یەکەم جار بە لەبەرچاوگرتنی خاڵەکانی سەرەوەش یەك تەڵاق بخات تا عیددەکەی[130] تەواو ئەبێت، خۆ ئەگەر ئەو ماوەیە بەسەریاندا تێپەڕی و هەر بەردەوام بوون لەسەر جیابوونەوە لە یەکتر ئەوا تەڵاقی یەکەم ئەکەوێ و پاشان تەڵاقی دووەم ئەخات ئەمیش هەر بە هەمان شێوەی تەڵاقی یەکەم ئەبێ لێی بووەستێ تا عیددەکەی بەسەر دەچێت، خۆ ئەگەر هەروەك خۆیان مانەوە و گۆڕانکارییەکی بەرچاو ڕووی نەدا لە نێوانیاندا، ئەو کاتە قۆناغی سێهەم دێتە پێشەوە کە (فامساك بمعروف) یا ئەوەتە بە خۆیاندا چوونەتەوە و بە ویست و ئارەزووی یەکتر دەکەن و پێیان خۆشە پێکەوە بژین ئەوا دەست ئەگرن بەو یەك تەڵاقەی کە ماویانە و بە تۆکمەیی و ئاگا لەخۆ بوونەوە و کارێك ناکەن بە تایبەت بۆ پیاوەکەیە ئەو تاکە تەڵاقەشی بکەوێ و ئیتر کۆتایی بە ژیانی ژن و مێردایەتییان بهێنێ.**

**یا (أو تسریح بأحسن) ئەگەر پاش لەدەست دانی دوو تەڵاقەکە هەر ناکۆکی و کێشمە کێشم بەردەوامیی هەبوو لە نێوانیاندا و بێ باك بوون لە جیابوونەوە لە یەکتر ئەوا پێویستە تەڵاقی سێهەمیش بخەن، بەڵام بە شێوازێکی باش و بێ زیان، (تسریح بإحسان) واتە: دیاری کردنی هەموو ماف و مارەییەك کە لە گەردنیایەتی و باس**

130 عیدەکەی بریتییە لە (ثلاثە قروء) واتە سێ پاکێتی یا سێ بێ نوێژی، خوای گەورە ئەفەرموێ (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ) واتە ئەو ژنانەی تەڵاق ئەدرێن پێویستە سێ (قروء) چاوەڕوانی بکەن، پاشان شوو بکەنەوە، هەندێکی تر لە زانایان ئەڵێن (قروء) یانی حەیز هەندێکی تر دەڵێن: یانی (طهر)، بەڵام بەڵگەی ئەوانەی کە بە (طهر) مانای ئەکەن بەهێزترە لەوانەی بە (حەیز) مانای ئەکەن، بۆ نموونە ئەڵێن: وشەی (ثلاثە) بە (مؤنثی) هاتووەو (قروء) ئەبێت لەو حاڵەتەدا بە (طهر) مانای بکرێ، چونکە (حیض) (مؤنث)ەو ئەمەش نابێت، چونکە لە (٣)وە تا (٩) پێویستە (معدود) پێچەوانەی (عدد) بێت.

نەکردنی شورەیی و نەنگییەك کە لەو ژنەدا هەیە بۆ هیچ کەسێکی تر، تا کەسانی تری لێ نەتەکێتەوە، چونکە لەوانەیە ئەو ئافرەتە بەو پیاوەی نەخواردبێ، بەڵام بۆ کەسانی تر چاك و لەبار بێت و پێکەوە زۆر گونجاو بن و بە یەکتری بخۆن.

## بۆچی تەڵاق دراوەتە دەست پیاوان؟

بێگومان تەڵاق یەکێکە لەو مافانەی کە خوای گەورە داویەتییە دەستی پیاو، چونکە پیاو لەپێناو پێکهێنانی پرۆسەی هاوسەرگیرییدا چەندین تەکلیفی لەسەر شانە وەك مارەیی و بژێوی و کڕینی ئەو هەموو کەل و پەل و پێداویستییەی کە پێویستی پێکهێنانی خێزانە، لەبەر ئەوەیە هەمیشە ئەو پیاوە بەتەنگ پاراستنی ئەو گرێیەستی هاوسەرگیرییەوەیە و هەڵنەوەشاندنەوەی ئەو خێزانەی کە جۆرەها قوربانی داوە لەپێناو بیناکردنیدا، هەروەها پیاو زیاتر خۆگر و ئارامترە و چاکتر بیر لە پاشەڕۆژ و عاقبەتی کارەکان ئەکاتەوە ئینجا هەڵدەستێ بە ئەنجام دانیان، بە پێچەوانەی ئافرەتەوە کە بە بچوکترین کێشە هەڵوێست وەرئەگرێ و هەڵچونێکی لە سنوور بەدەر ڕووی تێ دەکاو هۆش و ژیری خۆی لە دەست دەدا و کوێر ئەبێت لە ئاست عاقیبەت و پاشەڕۆژی کێشەکان، خۆ ئەگەر تەڵاق بەدەست ژنانەوە بوایە ئەوا ڕۆژانە دەیان پیاو تەڵاق ئەدرا و بە سەدان منداڵ سەرگەردان دەبوو، کەواتە بەرژەوەندی خێزان لەوەدایە کە تەڵاق بەدەست پیاوەوە بێت نەك ژن.

خۆ ئەگەر لە حاڵەتێکیشدا ئافرەتان ڕازی نەبوون لە مێردەکانیان بەهەر تاوان و ناتەواوییەك بێت وەك: بەرخورد و هەڵس و کەوتی ناشایستەی لەناو ماڵدا، یا ڕەوشت نزمی، یا کەم تەرخەمی لەو ئەرك و مافانەی کە لە ئەستۆیدایە، یا.. هتد. ئەوا ئەو ئافرەتە ئەتوانێت لە ڕێی قازییەوە لێی جیا ببێتەوە، واتە داڕنینی ئەو پیاوە لە خۆی بە مەرجێ ئەو مارەییەی کە هەیەتی یا هەر شتێکی تر کە قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە پیاوەکە لە کاتی پرۆسەی هاوسەرگیریدا خەرجی کردووە، لێرەدا وەك یارمەتییەك وایە بۆ پیاوەکە بۆ ئەوەی بتوانێ ژنێکی تر بخوازێتەوە و

دڵنەواییەکیش بێت بۆی هەروەك لە کاتی تەلاق دانی ژنەکەدا، بەرژەوەندی ژنەکەش لە بەرچاو دەگیرێت، لەبەر ئەوە پێویستە هاوسەنگییەك لە نێوانیاندا ڕابگیرێت و پیاوەکە لە ڕوویەکەوە زیان بکات و لە ڕووەکەی ترەوە کارئاسانی بۆ بکرێت (فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ).[131] واتە ئەگەر ترستان بوو لەوەی کە سنوورەکانی خوایی لە نێوانیاندا نەپارێزرا، ئەوا تاوان نییە لەسەر ئافرەتەکان کە جیاببنەوە بە مەرجێك قوربانیی جیابوونەوەکەیان بدەن، (مارەیی بێت یاهەر شتێکی تر).

لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە ژنەکەی سابتی کوڕی قەیس هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ناڕەزایی خۆی لە مێردەکەی دەربڕی، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو باخەی کە لە مارەییەکەتدایە ئەگێڕیتەوە بۆی؟ ژنەکەش وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە سابیت باخەکەی لێوەربگرەوە و زیادی مەکە لە سەری و تەلاقی بدە، ئەویش بە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و باخەکەی وەرگرتەوە و تەلاقی دا.[١٣٢]

دیارە نووسین لەسەر تەلاق کەسانی شارەزاو پسپۆڕی دەوێت، تا هەموو ووردەکارییەکانی بخاتە ڕوو، بەلام نوسینی من لەسەری تەنها وەك وەلام دانەوەیەك بوو بۆ نووسەری کتێبەکە و ناچار بووم وەك ئەرکێك بیخەمە ئەستۆی خۆم، لەبەر ئەوە ئەتوانم بڵێم ئەم باسە باسێکی کورتی تەلاق بوو کە ئەمڕۆ بووەتە گورزێکی کاریگەر بەدەست کەسانی نەشارەزاو دوژمن بەدینی خوا، هەر جارەی بە شێوەیەك بە خەیاڵی خۆیان ئیسلامی پێ ناشیرین ئەکەن و خەڵکانی بێ ئاگا و ناڕۆشنبیری پێ هەڵئەگێڕنەوە لە خواو ئاینە پیرۆزەکەی.

لە درێژەی ئەو یاسایانەدا بۆمان دەر ئەکەوێت کە ئیسلام هاوسەنگییەکی سەیری داناوە لەناو دامەزراوەی خێزاندا، لەکوێدا مافێك ئەدات بە پیاو بە بەرانبەریەوە ئەرکێکی ئەخاتە سەر شان و بۆ ئافرەتیش بەهەمان شێوە، تەنانەت پیاوەکە مافی

---

[131] سورة البقرة الأية (٢٢٩)

[132] البخاري : ٦/ ١٧٠ كتاب الطلاق باب (١٢) عن ابن عباس .

ئافرەتێك زەوت ئەكات یان ئافرەتێك مافی پیاوێك زەوت ئەكات ئەبێت بە بەرانبەریەوە شان بداتە ژێر ئەركێك بۆ نموونە تەڵاقدان كە پیاو ئەو مافە بە خۆی ئەدات ژنەكەی تەڵاق بدات پێویستە شان بداتە ژێر ئەركی قەرەبووكردنەوەی ئەو زیانەی بە ژن ئەكەوێت، خۆ ئەگەر ژن ئەو مافەی زەوت كرد لە پیاو و صوڵحی كرد پێویستە بە بەرانبەر ئەو مافەوە بە خۆی ئەدات شان بداتە ژێر ئەو ئەركەی كە بریتییە لە قەرەبووكردنەوەی ئەو زیانەی لەو پیاوەی ئەدات بەو تەڵاق لێوەرگرتنە لە هەموو بوارەكانی تری ناو دامەزراوی خێزاندا ئەم هاوسەنگییە ڕاگیراوە.

# دایەنی (الحضانه)

دایەنی دەستەواژەیەكە بەكار دەهێنرێ بۆ بەخێوكردن و پەروەردە كردنی منداڵ لە تەمەنێكی دیاریكراودا كە سەربەخۆییەكی نییە لە بەدیهێنانی كاری چاك و خۆپاراستنی لە كارێك كە تووشی زیان بێت پێیەوە..

ئایینی ئیسلام گرنگییەكی زۆری بە منداڵ داوە و كۆمەڵێك مافی لەسەر دایك و باوك دیاری كردووە بەرانبەریان تا ئەو منداڵە لە كەش و هەوایەكی لەبارو گونجاوی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی دا گەشە بكات و جێگای بەجێهێنانی داواو پێداویستییەكانی بێت.

دیارە ئەم دایەنیو بەخێوكردنەش كاتێك دێتە ئاراوە و گوێبیستی دەبین كە ژن و پیاوەكە لەیەكتر جویێ ببنەوە (بە مردنی دایكەكە بێت یا بە تەڵاق دانی و منداڵ لە نێوانیاندا هەبێت).

پاش ئەو جیابوونەوەیە باس لە چارەنووسی ئەو منداڵە ئەكرێت كە لەلای دایك بێت یا باوك یا كەس و كارەكەی؟ گومان لەوە ناكرێ كە پێش هەموو كەس لەم حاڵەتەدا بەرژەوەندی منداڵەكە لەبەر چاو ئەگیرێ و كەسێكی بۆ هەڵئەبژێرێت كە بە پێویستییەكانی هەڵسێت و هێلانەیەكی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی بێت بۆی.. گومانیش لەوەدا نییە كە دایك بە پلەی یەكەم خاوەنی ئەو سیفەتانەیە و تەنها

كەسێكە كە بتوانێ قەرەبووی هەموو ناتەواوییەكانی بكات، هەروەك لە فەرموودەیەكدا پێغەمبەرمان ﷺ ئاماژەی بەو نزیكییەی دایك كردووە لە منداڵ، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو وتی: (من أحق الناس بصحبتي؟) كێ لە هەموو كەس لە پێشترە بۆم تا هاوەڵێكی چاك بم بۆی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أمك، قال ثم من؟ قال: أمك، قال: ثم من؟ قال: أمك، قال: ثم من؟ ثم أبوك). دایكت، وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: دایكت، وتی پاشان كێ؟ فەرمووی دایكت، هەروەها باوكت.[133]

ئیبن حەزم لە كتێبی (المحلی)دا ئەڵێت: ئەم فەرموودەیە ئەوە ئەگەیەنێت كە دایەنی تەنها بۆ دایكە، چونكە لە پێشترین هاوەڵییەتی.

هەروەها عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ئەگێڕێتەوە كە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ان ابني هذا كانت بطني له وعاء) ئەم كوڕەم سكم دەفر و جێگەیەك بوو بۆی، (وثدي له سقاء) وەسینەم (مەمكەكانم) (كونە) بوو[134] بۆی (وحجر له حواء) وەباوەشم شوێنی حەوانەوەی بوو، باوكی تەڵاقی دام و ئەیەوێ كوڕەكەمم لێ بسێنێتەوە و لێمی بكات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (انت أحق به مالم تنكحي) تۆ لە هەموو كەس لەپێشتری بۆی ئەگەر شوو نەكەیتەوە.[135]

كەواتە فەرموودەكە ڕوونی ئەكاتەوە كە دایك بەهۆی ئەو سۆزو خۆشەویستییەوە بە پلەی یەكەم لە بەخێوكردن و پەروەردەكردنی منداڵەكەدایە...

هەروەها لە فەرموودەی تریشدا هاتووە كە با دایكەكەش شووی تر بكاتەوە هەر بۆی هەیە منداڵەكەی لای خۆی بهێڵێتەوە و پەروەردەی بكات بە مەرجێك لە توانایدا هەبێت. هەروەك لە بەڕائی كوڕی عازیبەوە ئەگێڕنەوە كە: كچەكەی حەمزە (ڕەزای خوای لێ بێت) دوای باوكی بەجێ دەمێنێ و هەرسێ هاوەڵ (صحابە) عەلی و جەعفەر و زەید (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەر یەكەیان داوای كچەكە ئەكەن تا بەخێوی بكەن،

---

[133] رواه البخاري ومسلم .

[134] كونە: پێستی بزنەو پاش خۆشە كردنی بەكار دەهێنرێت بۆ ئاو، واتە هەم ئاوی پێدەهێنرێت هەم ئاوەكەی تێدا هەڵدەگیرێ بە مەبەستی سارد بوونی.

[135] الشوكاني: نيل الأوطار (٧/ ١٣٨) .

**عەلی فەرمووی: ئەوکچە کچی مامی منە و لە ئێوە لەپێشترم لە بەخێوکردنیدا، لەو لاشەوە جەعفەر وتی: هەروەها کچی مامی منیشە و پوریشی کە خوشکی دایکییەتی خێزانمە، زەیدیش وتی: کچی برای منیشە، بەڵام لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دایە دەستی پورەکەی و فەرمووی: (الخالة بمنزلة الأم) واتە خوشکی دایك لە جێی دایکە.**

**ئەوەی کە لەم فەرموودەیەوە وەرئەگیرێ ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کچەکەی حەمزەی دایە دەستی پورەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەیزانی کە جەعفەر مێردیەتی و نامەحرەمیشە بە کچەکە، بەڵام پورەکەی بە جێگەی دایك دانا بۆی، کەواتە مافی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ هەر لە ڕێگەی دایکەوە ئەبێت، واتە تا دایك و خوشکی دایك وەستابن بە کەسی تر ڕەوا نییە، وەك پوور با مێردەکەشی نامەحرەم بێت مادام ژنەکەی دەبێتە پووری بە ئەم لەپێشترە.**

**کەواتە ئەگەر دایکی شوو بکاتەوە، هەر بۆی هەیە منداڵەکەی بگرێتەوە خۆی، لەم حاڵەتەشدا منداڵەکە دەبێتە مەحرەمی مێردی دایکەکە واتە (زڕکچ)، کەواتە دایك لەهەر حاڵەتێکدا بێت، ئەگەر بتوانێت واتە (نە زۆری لێبکرێت لە بەخێوکردنی، مێردەکەشی ڕازی بێت و توانای ئابووریشی هەبێت) بە پلەی یەکەم لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکەیەتی.**

**هەروەها ئوم سەلیم کە شووی کرد بە ئەبو تەڵحە ئەنەسی کوڕی لەلای مایەوە (ڕەزای خویان لێ بێت)، کاتێك کە ئوم سەلەمە شووی کرد بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو منداڵەکانی لەگەڵ خۆی دانا.**

**کەواتە بەپێی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دایك بۆ مەسەلەی دایەنی (پەروەردە و بەخێوکردن) بە پلەی یەکەم دادەنرێت، ئەو دایەنییەشی لێ وەرناگیرێتەوە، مەگەر دایکەکە خۆی توانای ئەو کارەی نەبێت لە هەر ڕوویەکەوە بێت، یا لە کاتی شوو کردنی دایکەکەدا، ئەگەر باوکەکەی مابوو، داوای منداڵەکەی خۆی کردەوە ئەوا دایەنیی دایکەکە هەڵئەوەشێتەوە، ئەم حاڵەتەش تەنها بۆ باوکە.** [136]

[136] المرأة في الفكر الأسلامي، جمال محمد فقى رسول الباجوري: (ج٢، ص ٦٢ — ٦٥) .

**لە ڕاستیدا مەسەلەی دایەنی مەسەلەیەکی گرنگە و ئیسلام زۆر بە وردی باسی لێوە کردووە، بەڵام لێرەدا وەڵامی ئێمە پێم وایە تەنها ئەوەندە بەس بێت بۆ کاکی نووسەر کە بەبێ ئەوەی ئاگای لە ئیسلام و گرنگیدانی بەو بوارە، لۆمەی کچانێك دەکات کە دەبنە بالآپۆش و سبەینێ یەکێك لەو مافانەی کە (دایەنی)یە لێی ئەسەنرێتەوە و هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت، بە بۆچوونی خۆم وائەزانم ئەو چەند بەلگەیە بەس بێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو درۆ و گومانە دوور لە ڕاستییەی کە نووسەر ئەیەوێت خوێنەرانی کورد هان بدات لە ئیسلام و دژایەتی ئەو دینەیان پێ بکات و بیانکاتە نەیار بۆ دین، بەڵام ئەوەش خەیاڵەو هەرکەس کەمترین توێژینەوە بکات لەسەر ئیسلام بۆی دەرئەکەوێت کە نەیارانی ئیسلام چەند نەزانانە یا چەند بێویژدانانە باسی ئیسلام ئەکەن.**

**١٨- نووسەر لە بابەتی (سیاسەت بەدەنگ دان و بێ دەنگ دان)[137] دا باسی ئەوە ئەکات کە ژنان لە دەوڵەتێکی ئیسلامی نموونەییدا چۆن ئەتوانن کار بکەن هەرچەندە ئەمە باسێکە و جێگای مشت و مڕە لە کاتێکدا ناتوانن ببن بە خەلیفە یا قازی. هەر خۆی دەڵێت: مێژووی کۆمەڵگەی مەدینە ئەوە نیشان دەدات کە ژنان بەشدارییان کردووە لە بڕیاری کاریگەرداو لە قسەو باسی سیاسیدا ئامادە بوون، ژنان زۆر جار قسەو باسیان لەگەڵ موحەممەد و خەلیفەکانی پەیڕەوی ئەودا بووە، هەندێك جاریش بیروباوەڕەکانیان کاریگەری خۆیان سەلماندووە.**

**ئێمە بۆ کورتکردنەوە و چڕکردنەوەی ئەو باس و خواسانە لە چەند بڕگەیەکدا باسی دەکەین.**

## ئافرەت و پلەی دادوەری و ڕامیاری:

**سەرەتا باسمان لەوە کرد کە چین و توێژی ئافرەتان لە هەموو ئایین و گەلانی پێش هاتنی ئایینی ئیسلام پەراوێز خرابوون، بەڵکو هەر یەکە بە شێوازێك پێناسەی بۆ**

[137] لاپەڕە (٢٦١)ی کتێبی (کچانی خوا).

ئافره‌ت ده‌كرد كه‌ تا سه‌ر ئێسقان زوڵم و سته‌م بوو به‌رانبه‌ریان، به‌ڵام له‌ پاش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ڕزگاركه‌ری مرۆڤایه‌تی. ئافره‌تان به‌شدارییان له‌ هه‌موو چالاكییه‌كانی ژیانیان كرد و لاپه‌ڕه‌كانی مێژووش به‌ شانازییه‌وه‌ له‌ خۆیان ده‌گرێ و بوونه‌ته‌ پێشڕه‌وی هه‌موو ئافره‌تانی پاش خۆیان گه‌ر بیانه‌وێ بوونی خۆیان بسه‌لمێنن، دیاره‌ یه‌كێك له‌و بوارانه‌ی كه‌ توانیویانه‌ ڕۆڵی كاریگه‌ری خۆیان ببینن تێیدا و (موفتی) ده‌توانێ (فه‌توا)ی خۆی له‌سه‌ر بدات و پێغه‌مبه‌ر ﷺو خه‌لیفه‌كانی ڕاشیدین بكاته‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر ڕه‌زامه‌ندی، بگره‌ ته‌شویق كردنیشیان پله‌ی دادوه‌ری و ڕامیارییه‌.

ئیمامی ئه‌بوحه‌نیفه‌ ڕای وایه‌ كه‌ ئافره‌ت مادام شاهێدی لێ وه‌رده‌گیرێ له‌ هه‌موو بواره‌كاندا بێجگه‌ له‌ (الأمور الجبائية) تاوانی سزاكاری، به‌هه‌مان شێوه‌ بۆی هه‌یه‌ دادوه‌ری بگرێته‌ ده‌ست و كاری پێ بكات، هه‌روه‌ك شایه‌تییه‌كه‌، به‌ڵام تاوانی سزاكاری، نه‌خێر، چونكه‌ كار و وه‌زیفه‌ی ئافره‌ت نییه‌ و ناتوانێ وه‌ك پێویست به‌و كاره‌ هه‌ڵسێت و ئه‌نجامی بدات.

به‌ڵام هه‌ردوو پێشه‌وا (ته‌به‌ری) و (ئیبن حه‌زم) ڕێگه‌یان داوه‌ به‌ دادوه‌ری ئافره‌تان له‌ هه‌موو بواره‌كاندا به‌ تاوانی سزاكاریشه‌وه‌.

هه‌رچه‌نده‌ ئه‌م ڕێگه‌پێدانه‌ش ئه‌وه‌ ناگه‌یه‌نێ كه‌ كاركردنی له‌و بوارانه‌دا پێویسته‌ و هه‌ر ده‌بێ بیكات، نه‌خێر، به‌ڵكو له‌ گۆشه‌نیگای به‌رژه‌وه‌ندی ئافره‌ت و خێزان و كۆمه‌ڵگا و ئیسلام ده‌بێت، كاتێك كه‌ ئه‌و به‌رژه‌وه‌ندییانه‌ له‌به‌ر چاو گیرا ئه‌وا هه‌ندێ ئافره‌تی به‌ تواناو له‌ ته‌مه‌نێكی دیاری كراودا هه‌ڵده‌بژێرێ و ئیش و كاری تایبه‌تیان پێ ئه‌سپێردرێ كه‌ بتوانن ئه‌نجامی بده‌ن، به‌ڵام ڕێگرتنیان له‌وه‌ی كه‌ ببنه‌ فه‌رمانڕه‌وا یا سه‌رۆكی ده‌وڵه‌ت نه‌بوونی توانای جه‌سته‌یی و فكری و ژیرییانه‌ كه‌ له‌ كاتی نه‌خۆشییه‌كانی حه‌یز و منداڵ بوون و.. هتد.

كه‌ گرفتیان بۆ دروست ده‌كات و ئه‌و كاته‌ وه‌ك پێویست به‌رگه‌ی كێشه‌ و به‌رانبه‌ركێی ده‌وڵه‌تداری ناگرێت به‌ گشتی، خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و ڕێگرانه‌ به‌ به‌ره‌و پێش چوونی ته‌مه‌ن له‌ناو چوون ئه‌وا ئه‌و مافه‌یان بۆ ئه‌گه‌ڕێته‌وه‌، نموونه‌ی زیندوی مێژوویشمان زۆره‌ كه‌

ئافرەتان توانیویانە زۆر لێهاتوانە كاروباری دەوڵەت بگرنە ئەستۆ و سەركەوتوش بن تێیدا، وەك: پاشای (سە بەء) كە خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژە بە ژیری و لێهاتوویی ئەو ئافرەتە دەكات كە چۆن خۆی و گەلەكەی بەرەو بەختەوەری دونیا و قیامەت برد، لەگەڵ ئەوەشدا سەدان پیاوی ئازاو چاونەترسیشی لەبەر دەستدا بوو، پرس و ڕاوێژیشی پێكردن‌و هەر هەموویان هاودەنگ بوون لەسەر پێكدادان و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سولەیمان و سوپاكەیدا، بەڵام سەرەنجام زۆر بە ژیرانە و بێ گیروگرفت ڕاوبۆچوونەكەی خۆی سەپاند و گەلەكەشی لە كوشتن و تیاچوون ڕزگار كردو بەو ئاقیبەتە خێرەشی گەیاندن.

هەروەها ئەروای كچی ئەحمەد كە مەشهور بوو بە (الحرة الصليحية) كارو باری یەمەنی گرتەدەست پاش نەخۆش كەوتن و مردنی مێردەكەی. (شجرة الدرّ) كە پادشای میسر بوو، هەروەها (أم المقتدر بالله) كە دایكی یەكێك لە خەلیفەكانی عەباسی بوو، ناوی (غەریب) بوو ئەم ئافرەتە خەمخۆرە هەمیشە لە جەلەسەی ستەملێكراوەكاندا ئامادەیی هەبوو، بە خاتری پشتگیری كردنیان و بەدەست خستنەوەی مافەكانیان، هەروەها لە مەجلیسی قازی و ڕیش سپی و ئەزموندارانی گەلدا دادەنیشت و تاوتوێی‌و گرفت و كێشەكانیان دەكرد، پاشان هەر بڕیارێكیان دەربكردایە ئیمزایان دەكرد كە ئیمزای ئەم ئافرەتە بەڕێزە یەكێك بوو لە ئیمزاكان.

ئەتوانین دوور نەڕۆین و هەر لەناو خۆماندا و لە مێژوویەكی نزیكدا چەندین ئافرەتی هەڵكەوتووی بە توانا و خزمەتكار بە گەل و نیشتیمان ئاماژە پێبدەین كە بەوپەڕی لێبڕاوی و نەبەردییەوە جڵەوی كاروباری وڵاتیان گرتۆتە دەست و بوونەتە مایەی خۆشگوزەرانی و بەرەو پێشبردنی گەل و نیشتیمان لە زۆر ڕووەوە:

## ١ـ عادلە خانم

عادلە خانم كچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقرانەو بە خانمی وەسمان پاشا بەناوبانگە، لەدایك بووی شاری سنەی كوردستانی ڕۆژهەڵاتە، لە ساڵی ١٨٩٥ی زایینی بووەتە هاوسەری عوسمان بەگی كوڕی موحەممەد پاشای جاف كە دانیشتووی شاری هەڵەبجە

بووەو لە هەمان کاتیشدا قائیمقامی شارەکەش بووە، عادلە خانم بە هۆی زیرەکی و دامەزراوی و ژیرییەکی بێ وێنەوە توانیوێتی هەمیشە پشتیوانی لە هاوسەرەکەی بکات لە بەڕێوەبردن و بەرەو پێش چوونی کارەکانی لە ناوچەکەدا واتە بە ناڕاستەوخۆ ڕابەرایەتی لە دەستی خۆیدا بووە، هەروەها دەستی باڵای هەبووە لە دروستکردنی ڕۆحی تەبایی و برایەتی لە نێوان تاکە تاکەی هۆز و عەشیرەتی جاف دا و بە هۆکاری مانەوەی دەسەڵاتی خۆی زانیوە لە ناوچەکەدا شایانی باسە ئەو زیرەکی و لێهاتووییەی بە شێوەیەك بوو کە بتوانێ لە ماوەیەکی کەمدا دەست بگرێت بەسەر ئیش و کارەکانی هاوسەرەکەیدا و کاروباری ناوچەی شارەزوور و عەشیرەتی جاف بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، دیارە هیچ کارێکی میری جێبەجێ نەئەکرا بەبێ ڕاوێژکاری ئەو، هەموو گیروگرفتێکی ناوخۆ ئەخرایە بەردەستی و بە دادوەرانە تاوتوێ و یەکلایی ئەکردەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش بەندیخانەیەکی تایبەتی دروست کردبوو تا کارەکانی زیاتر تۆکمەیی بە خۆیەوە ببینێ، مێجەرسۆن کە کابرایەکی ئینگلیزی بوو، بەکاری سیخوڕی بۆ وڵاتەکەی سەردانی کوردستانی کردبوو، کە سولەیمانی مەڵبەندی مانەوە و دانیشتنی بوو، ماوەیەکی زۆر لە دیوەخانی عادیلە خانم دا ژیاوە و بە تەواوی ئەم خانمەی لە یەکێك لە کتێبەکانیدا هەڵسەنگاندووە و دەربارەی ئەڵێت: عادلە خانم ئافرەتێکی زۆر زیرەك و لێهاتووەو بە ڕێك و پێکی و دادوەرانە ڕابەرایەتی ناوچەی شارەزوور و دەوروبەرەکەی دەکات.

عادلە خانم هەر لە شاری هەڵەبجەدا بازاڕێك و سێ ماڵی گەورەی دروست کرد و مزگەوتێکیش کە بە ناوی خۆیەوە ناونراوە کە (مزگەوتی خانم)ەو لە گەڕەکی پیرموحەممەد لە تەمەنی (٦٥) ساڵیداو لە ساڵی ١٩٢٤ زایینی دا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی عەبابەیلێی تەنیشت هەڵەبجەوە نێژراوە.

## ٢ـ خانزاد

خانزاد کچی حەسەن بەگەو ژنی میر سلێمان کوڕی شکەلی بەگە و میری سۆرانە، ئەم ئافرەتە تا بڵێی ئازاو بە جەرگ و سوارچاك بووە، هەر بە وێنەی پیاوان چەك و

سیلاحی ئەبەست و لە پێشەوەی چەکدارەکانی ئەچووە ناوجەرگەی هەموو شەڕ و شۆڕشێك.

سلێمان بەگی هاوسەری خانزاد لەگەڵ حکومەتی بەغداد تێك ئەچێ لەسەر هەڵسووڕانی کاروباری وڵاتەکەی، جا بەم بۆنەیەوە سلێمان بەگ بۆ خۆڕێکخستنەوە ئەچێتەوە شاری بەغداد، بەڵام مەخابن لەوێ بەهەر فروفێڵێك بێت ئەیگرن و ئەیخەنە زیندانەوە، پاشان هەر بەوەشەوە ناوەستن دەرمانخواردی ئەکەن و ئەمرێت، کاتێك خانزادی تێکۆشەر ئەزانێ سلێمان بەگیان بەدیل گرتووە دەستبەجێ سەرۆکاری ئیمارەتی سۆران ئەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو بە چالاکی و زرنگی کاروبارەکانی وڵات هەڵئەسوڕێنێت و بە هەموو توانایەکییەوە پارێزگاری لە سەربەستی و سەربەخۆیی گەلەکەی کردووە، هەر بۆیە تا خانزاد فەرمانڕەوا بوو، دەوڵەتی سۆران بە سەربەخۆیی ژیا.

خانزاد گەلێ مزگەوت و قەڵای بەرگری و قوتابخانە و پردی دروست کرد، پەشێوی لە وڵاتا نەهێڵا و هەمیشە لە خزمەت هەژار و کەمتوانا و ستەملێکراودا بوو، تەنانەت بە شەوانیشدا ئەگەڕاو چاودێری ماڵانی ئەکرد تا بزانێ کەم و کورتی و پێداویستییەکانیان چییە، بەڵام پاش نەمانی خانزاد حوکمڕانی سۆران بەرەو خراپی ڕۆیشت و سەرکردە و میرەکانی تر نەیانتوانی کاروبارەکانی بە ڕێکوپێکی هەڵسوڕێنن تا کۆتاییان پێ هات.

بەڵام خانزادە دلێر توانی بە هەموو لایەك بسەلمێنێ کە ئافرەتیش خاوەن دەسەڵاتە و لەگەڵ پیاواندا لە زۆر ڕووەوە چوون یەکن و ئەگەر بواریان بۆ بڕەخسێت ئەتوانن کاری گەورە گەورە ئەنجام بدەن.

## ٣ـ دەوڵەت خان[١٣٨]

[138] کتێبی ئافرەتە ناودارەکانی کورد نوسینی عبدالجبار محمد الجباری .

دەوڵەت خان ژنی عیززەدین موحەممەد (میری لوڕستانی بچوك) بوو، لە خێزانی (خورشیدی)[139]ن. ئەم خاتوونە پاش مردنی هاوسەرەکەی و لە ساڵی ٧٦١ی کۆچی جڵەوی فەرمانڕەوایی و ئیش و کاری لوڕستانی گرتە دەست، هەرچەندە سەرکەوتوو نەبوو لە دامەزراندنی ئەمن و ئاسایشی وڵاتدا بە هۆی کێشە و گرفتی ناوخۆیان لەسەر پلە و پایە و کورسی، لە ئەنجامدا دەوڵەت خان ناچارکرا ئیش و کاری فەرمانڕەوایی بۆ عیززەدینی برای بەجێ بهێڵێت، دیارە خۆبەدەستەوەدانیشی هەر کارێکی نەبەردانە بووە بۆ نەهێشتن و کپ کردنەوەی ئاژاوە و فیتنە لەناو وڵاتەکەیدا.

لە ڕاستیدا ئافرەتانی لێهاتوومان زۆرە لە بوارەکانی تێکۆشان و فەرمانڕەوایی و فەرمان دان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی دروست، بەڵام ناتوانرێ لە نووسینێکی کورتی بەم جۆرە ئاماژەیان پێ بکەین، بەڵام هەر لەسەر بنەمای (مشتێك نموونەی خەروارێکە) ئاماژەمان بەو چەند ئافرەتە قارەمانە کرد کە چۆن توانیویانە ڕۆڵی کاریگەری خۆیان ببینن و کەسایەتی خۆیان بسەلمێنن و ڕووی لاپەڕەکانی مێژوو بە خۆیان سپی بکەن.

## ئافرەت و کارکردن:

خوای گەورە هەردوو ڕەگەزی ژن و پیاوی دروست کردووە و لەسەر زەویدا جێگیری کردوون، ئاوەدان کردنەوە و برەودان بە ژیانی خستۆتە ئەستۆی هەردووکیان، میهر و خۆشەویستی لە نێوانیاندا فەراهەم هێناوە تا بە هاوکاری کردنی یەکتر تەنگ و چەڵەمە و سەختییەکانی ژیان بڕەوێننەوە و کارەکان بۆ یەکتر ئاسان بکەن.

ئاشکرایە کە دروستکردنی ئەو دوو ڕەگەزەش هەروا بە هەڕەمەکی و بێ بەرنامەیی نەبووە، بەڵکو وردەکارییەکی لە سنوور بەدەر لە دروست کردنیاندا بە خەرج دراوە تا

[139] بنەماڵەیەکی کوردەو لە ساڵی ١٢٢٤ زایینی فەرمانڕەوایی لوڕستانی بچوکیبان کردووە لە ئێران.

بە هەردووكیانەوە لەو ئاوەدانكردنەوەیەدا دەستی باڵایان هەبێت و پێكەوە ڕەوڕەوەی ژیان بجوڵێنن و بەردەوامی بە ژیان بدەن.

هەرچەندە لە سەرەتاوە باسمان لەوە كردووە كە هەریەكە لە ڕەگەزی ژن و پیاو خاوەن كۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆیانن تا بتوانن هەستن بەو كارەی كە پێیان سپێردراوە، بۆ نموونە: ڕەگەزی ژن خاوەنی هەندێ سیفاتی سروشتی وەك دڵ نەرمی و میهر و سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی و هەڵچوون و زوو بە دەمەوە چوون بە حوكمی كارەكەی و... هتد. هەر هەموو ئەم سیفەتانە لە ئەسڵی دروست بوونی خانەكانی مێشك و جەستە و دەرونیدایە و یارمەتیدەریەتی تا بتوانێ بە كاری سكپڕی و منداڵ بوون و شیردان و پەروەردە و پێگەیاندن هەڵسێت، دیارە ئەم كارانەش هەروا ئاسان نییە، بەڵكو گەورەترین و پیرۆزترین كارە و بەرهەمهێنەری پیاوانی دوارۆژن كە چارەنووسی گەلان ئەكەوێتە دەستیانەوە، جا لەبەر ئەوە هەستان و وەستان بەرانبەر بەم ئەركە گەورە و پیرۆزە پشتیوان و یارمەتیدەرێكی بەهێز و كارامەی دەوێ تا زەمینەیەكی لە باری بۆ ساز بكات و تەواوكەری ئەو ژنە بێت لەو بەرهەم هێنانەدا، دیارە ئەو كەسەش ڕەگەزی بەرانبەرە كە پیاوانن و خوای گەورە كردونی بە خاوەنی كۆمەڵێ سیفاتی سروشتی وەك زبری و خۆگری و بەهێزی ماسولكە و پێست و تێكڕای خانەكانی لەشی كە بتوانن بەكاری بژێوی پەیداكردن و ئیدارەدانی خێزانەكەی هەڵسێت و بیانپارێزێت لە هەر ڕووداوێكی دەرەكی و ناوەكی و لە هەڵوەشان و تیاچوون.

لێرەدا بە هۆی سروشتی دروست بوونی هەردوو ڕەگەزەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە كە سەرەكیترین كاری ئافرەتان كاریماڵەوەیە و پەروەردە و پارێزگاری كردنیانە لەو نەوەیەی كە لەبەردەستیاندا بە شێوازێكی دروست تا بتوانن كۆمەڵگایەكی دروست لە هەموو ڕوویەكەوە پێك بهێنن.

كەواتە گەر ئافرەتان بە خۆیان بزانن ناسكترین و پیرۆزترین ئەركیان لەسەر شانە و پێویستی سەرشانی ڕەگەزی بەرانبەرە كەش و هەوایەكی ئارامیان بۆ بڕەخسێنن لە ڕێگای كار كردن و بژێوی پەیداكردن بۆ هەموو پێداویستییەكانی ژیان، ئەو كاتە

ژنەكەش ئەتوانێ وەك پێویست بە ئەركی خۆی هەلسێت و مایەی بەختەوەریش بێت بۆ خێزانەكەی.

پێویستە ئاگاداریش بین لەوەی كە كاركردن لە دەرەوەی ماڵ و بژێوی پەیداكردن ئەرك و واجبی سەر شانی پیاوانە بە شەرع و بە یاسا واتە ئەگەر پیاوان كەمتەرخەم بوون لە ئاست بژێوی پەیداكردندا، ئەو ژنە بۆی هەیە داوای هەلوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری بكات.

بەلام با بزانین چۆن ئەو كێشەیە پێچەوانە بویەوە و شتەكان ئاوەژوو بوونەوە؟

كە ئەبوو دامەزراوەی خێزان لە دەرەوە و لە ناوەوە مەحكەم بكرێت و پیاو كاری مەحكەمكاری لە دەرەوە بكات و ژنیش كاری مەحكەمكاری لە ناوەوە بكات؟!

دوای شەڕەكانی جیهانی یەكەم و دووەم و تیاچوونی زۆرینەی پیاوان و گەنجانی ئەوروپا، هەژاری و نەداری بە تەواوەتی بالی بەسەر خێزانەكاندا كێشا و كارگە و بازاڕەكان لەكار كەوتن، هەر بۆیە بۆ چارەسەری ئەو گرفتەو پڕكردنەوەی بۆشاییەكان، ژنانیان پەلكێشی ناو كارگەو بازاڕەكان كرد با دژ بە تواناكانیشیان بێت، تا وردە وردە ژنان ئاگایان لە ماڵ و منداڵەكانیان نەما و توانای پەروەردە و پێگەیاندنیان لە دەست داو خێزانەكانی ئەوروپا بەرەو هەلوەشان و لێكترازان چوون بە شێوەیەك كە زانایانی ڕۆژئاوای سەدەی بیستەمی بە هاوار هێنا و لەم ڕووەوەو داوای گەڕانەوەی ژنان ئەكەن بۆ ماڵەكانیان و پیادەكردنی كارو وەزیفەی سروشتی خۆیان.

فەیلەسوفی بەناوبانگ (أجوست كونت) لە كتێبی (النظام السياسي على حسب أصول الفلسفة الحسية)دا، دەربارەی ئیش و كاری ئافرەتان لە دەرەوەی ماڵدا و ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی كە بەناوی ئازادی و سەربەخۆییەوە لێی دەكرێت بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ و هۆكاریشە بۆ تێكچوونی باری كۆمەلایەتی ئەلێت: (ولكن بدل هذه الاحلام الهادمة المفسدة، يمكن أن قاعدة طبيعية تضمن حياة المرأة تماماً، وذلك يكون بنعيين وتحديد الواجبات المادية على الجنس العامل (الرجال) نحو الجنس المحب (النساء).

(يجب أن يكون الرجل نفِدي المرأة، هذا هو القانون الطبيعي لنوعنا الإنساني، وهو قانون

يلائم الحياة الأصلية المنزلية للجنس المحب (النساء)، وهذه القاعدة التي تريك أخشن أشكال الإجتماع تتحسن وتكمل على قدر في النوع الإنساني، فان كل الترقيان المادية التى تتطلبها الحالة الحالية للنساء تستحيل الى لزوم تطبيق هذا الواجب الأساسي بالدّقة ويجب أن نتائجه تحدث ردفعل على كل العلاقات الإجتماعية وباالأخص بالنسبة لأجر العملة. هذا هو القانون الذي يلائم الميل الفطري يرتبط بوظيفة النساء الشريفة بصفتهن عاملاً حبيباً للآلة المولدة للحركة. وهذا الإجبار (اجبار الرجل على تفذية المرأة) يشبه ذلك الأجبار الذي يقضي على الطبقة العاملة من الناس بأن تفذي الطبقة المفكرة منهم لتستطيع هذه أن تتفرغ باستعداد تام لأداء وظيفتها الأصلية. غير أن واجبات الخبس العامل من الجهة المادية نحو الخبس المحب هي أقدس من تلك تبعا لكون الوظيفة النسائية تقتضي الحياة المنزلية. ولكن بالنسبة للمفكرين فأن هذا الإجبار يكون تضامنياً فقط نجلافه بالنسبة للنساء، فأنه ذاتي).[١٤٠]

**ئەمە قسەی یەکێك لە مامۆستا و فەیلەسوفە هەرە بەناوبانگەکانی سەدەی بیستەم و وڵاتانی ڕۆژئاوا کە پاش چەندین ساڵ لێکۆڵینەوە و قوڵبونەوە لە فەلسەفەدا بۆی دەرکەوتووە کە پێویستە هەر یەکە لە ژن و پیاو بە کارو وەزیفەی سروشتی خۆیان هەڵسن تا جۆری مرۆڤەکان (النوع الانساني) پارێزراو بێ و دەرگای کەم و کورتییە کۆمەڵایەتییەکان دابخرێت.**

**هەروەها زانای فەڕەنسی (لوجوفیە) لە کتێبەکەیدا ئەڵێت:**

**(يجب أن المرأة تبقى مرأة، فأنها بهذه الصفة تستطيع أن تجد سعادتها، وأن تهبها لسواها).[١٤١] (فلنصلح حال النساء ولكن لا نغيرها، ولنحذر من قلبهن رجالاً لأنهن بذلك يفقدن خيراً كثيراً، ونفقد نحن كل شئ، فان الطبيعة قد أتقنت كل ماصنعته، فندرسها ولنسع في تحسينها، ونخش كل مايبعد عن قوانينها وأمثلتها).[١٤٢]**

140 المرأة المسلمة لمحمد فريدو جدى ص٦٠

141 المرأة المسلمة لمحمد فريدو جدى، ص٦٦.

142 ئەم جۆرە زانا و فەیلەسوفانە هەرچەندە باسی خوا ناکەن و ئەوەتا ئەڵێ (سروشت شتەکانی چاك دروست کردووە)!! لە جیاتی ئەوەی بڵێ: (خوا شتەکانی جوان خولقاندووە) .. لەگەڵ ئەوەشدا دان بەوەدا ئەنێن کە

**شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئافرەت بە کار و وەزیفەی سروشتیی خۆی هەستێ زیاتر خەیر ئەداتەوە بۆ کۆمەڵگا و ماف و ڕێزی خۆشی زیاتر پارێزراو ئەبێت، هێنانی قسەی ئەم دوو زانایە و چەندین زانای تریش بۆ دەمکوتکردنی کەسانێکە کە گۆرانی بە باڵای ڕۆژئاوادا ئەڵێ و بە ناوی ئازادییەوە ئافرەتانی پێ ئەسیر ئەکات.**

**ئەگینا هەر لە ئەسڵی دروست بوونی هەردوو ڕەگەز و جیاوازی سروشتی لە نێوانیاندا لە لایەن خوای گەورەوە مانەوە و بەردەوامی دانە بە ژیانی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی دروست کە هیچکام لەو دوو ڕەگەزە سوودمەند نەبێ لەسەر حیسابی ڕەگەزی بەرانبەر و هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی تریان بن.**

**جا قسەکردنمان لەسەر ئەم بابەتە و هێنانەوەی بەڵگەی زانایانی ڕۆژئاوا، تەنیا بۆ دامەزراندنی قەناعەتە بۆ ئەو کەسانەی نموونەی گەورەی خۆیان لە ڕۆژئاوادا ئەبینین ئەگینا ئێمەی موسڵمان و ئیسلامدۆست ئەوەندەمان بەسە کە ئەو شتە خوا و پێغەمبەر ﷺ بیفەرموون، (سامویل سمایلس)یش یەکێکە لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی شۆڕشی بەریتانی ئەڵێت: ئەو یاسایەی کە ئافرەتی خستە گەڕ بۆ کارکردن لە کارگەکاندا، با دەستی باڵای هەبوو بێت لە زیاد کردنی سەروەت و سامانی وڵاتدا، یاسایەك بوو دەرئەنجامەکەی ڕووخاندن و هەڵوەشانی ژیانی خێزانی بوو، چونکە پەلاماریك بوو بە ڕووی پەیکەری ماڵ و خانەوادەدا، کە بنچینەکانی خێزانی لە یەك ترازان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لەبار برد، وەك دوورخستنەوەی ژن لە مێردەکەی و منداڵ لە کەسو کاریو.. هتد. کەواتە کاری سەرەکی ئافرەت ئەوەیە کە بە کارەکانی ناو ماڵ هەڵسێت وەك بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ و ڕێکخستنی باری ئابووری و جێبەجێ کردنی پێداویستییەکانی ناو ماڵ، بەلام کار و**

---

دژایەتی یاساکانی ئەو سروشتە (واتە ئەو خوا خولقێنەرە) مایەی تیابردنی خێری گەورەیە بۆ ژنان و مایەی لەدەستچوونی هەموو خێر و خۆشیەکە بۆ پیاوانیش.

**کارگەکان لە هەموو ئەم ئەرکانەی دائەڕنیٚ و ئەو کاتە ماڵەکە پێی ناوتریٚ ماڵ، منداڵەکانیش ئەبنە قوربانی و پەروەردەیەکی دروست ناکرێن.[١٤٣]**

**پزیشکی شارەزاو پسپۆڕی ئەمریکی خاتوو (إیدا أولین) ئەڵێت: هۆکاری گێروگرفت و دژوارییەکانی خانەوادە لە ئەمریکاو زۆربوونی تاوان لە کۆمەڵگادا دوورخستنەوەی ژنانە لە ماڵەکان بە بیانووی زیاد کردنی سامانی ماڵ، سامانی ماڵ زیادی کرد، بەڵام ئاستی ڕەوشت دابەزی، هەر بۆیە ئەم خاتوونە داوای گەڕانەوەی دایکەکان ئەکات بۆ ماڵەکانیان تا قەدر و ڕێز بگەڕێتەوە بۆ ڕەوشت و منداڵان سوودمەندبن لەو سۆز و میهر و پەروەردەیەی کە بێبەش بوون لێی بە هۆی چوونە دەرەوە و سەرقاڵ بوونی دایکیان بە کاری بژێوی پەیداکردن و بەرزکردنەوەی باری ئابووری، پاشان ئەم دکتۆرە بەڕێزە ئەڵێت: تاقی کردنەوەکان دەریانخستووە کە گەڕانەوەی ژنان بۆ ماڵەکانیان تەنها ڕێگایە بۆ پاراستنی نەوەی نویٚ لە شکست و تیاچوونێك کە بەرەو ڕووی دەڕوات[144].**

**هەروەها لە ڕاپرسییەکدا کە پەیمانگای غالوب لە ئەمریکا پێی هەڵسا دەربارەی بۆچوونی ئەو ژنانەی کە لە دەرەوەی ماڵ کار دەکەن، بە هۆی ماندوێتی ژنانی کارکەری ئەمریکی ئەنجامەکەی بەوە دەرچوو کە ٦٥٪ی ئەو ژنانە داوای گەڕانەوەیان ئەکەن بۆ ماڵەکانیان، دکتۆر (إیدا أولین) ئەڵیٚ: جاران ژنان وایان ئەزانی بە ئومێد و هیوای خۆیان گەیشتوون لە کارکردندا، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی ئەو هەموو گرفت و سەرسمتدانەی کە هاتۆتە ڕێگای و هەموو هێز و تواناکانی خۆی لە دەست داوە، تەمەنا و خوازیارە بگەڕێتەوە لانەکەی و سەرپەرشتی بێچووەکانی بکات[145].**

**جا قسەکردنمان لەسەر ئەم بابەتە و هێنانەوەی بەڵگەی زانایانی ڕۆژئاوا لەسەری ئەوە ناگەیەنێت کە ئیتر ئافرەت بە هیچ شێوازێك نەتوانێت مومارەسەی خۆی بکات**

---

[143] (دائرة معارف فريد و جدى) ج٨، ص٦٣٩، لە کتێبی (المرأة بين الفقه والقانون) للدكتور مصطفى السباعي، ص٢٥٢، وەرگیراوە.

[144] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٢.

[145] كتاب السباعى السابق، ص٢٥٩ .

له‌ ده‌ره‌وه‌ى خێزان، به‌ڵكو مه‌به‌ست پێى، به‌ زۆر ناچار نه‌كرێت كه‌ كار بكات و بژێوى په‌یدا بكات.

ئه‌گینا وه‌ك ڕه‌زامه‌ندى خۆى و هه‌ستانى به‌ كارێك كه‌ له‌گه‌ڵ هه‌ست و تواناكانیدا گونجاو بێت وه‌ك كاركردنى له‌ بوارى پزیشكى و مامۆستایى و درومان و.. هتد. به‌ مه‌رجێك كار له‌ وه‌زیفه‌ سه‌ره‌كییه‌كه‌ى نه‌كات كه‌ به‌ڕێوه‌بردن و ئیداره‌دانى ماڵ و په‌روه‌رده‌ و پێگه‌یاندنى منداڵه‌.

یاخود زه‌روره‌ت واى لێ بكات كه‌ به‌كارى ده‌ره‌وه‌ و بژێوى په‌یداكردن هه‌ڵسێت، با كار له‌ ماڵه‌وه‌شى بكات حاڵه‌تێكى ناچارییه‌ و پێویسته‌ پێى هه‌ڵسێت، بۆ نموونه‌ خواى گه‌وره‌ له‌ قورئاندا باس له‌ كچه‌كانى شوعه‌یب پێغه‌مبه‌ر (سه‌لامى خواى لێ بێ) ئه‌كات كه‌ ئاوى مه‌ڕ و ماڵاته‌كه‌یان داوه‌ به‌ هۆى په‌ككه‌وتن و بێ توانایى باوكیانه‌وه‌ و نه‌بوونى كوڕ، یاخود پیاوێك له‌ ماڵه‌كه‌دا كه‌ ئه‌و ئه‌ركه‌ بگرێته‌ ئه‌ستۆ، به‌ڵام كاتێك كه‌ (موسا) (سه‌لامى خواى لێ بێ) وه‌ك پیاوێك غیره‌تى جوڵا و چووه‌ لایان و پرسیارى لێ كردن كه‌ بۆچى وه‌ستاون؟

ئه‌وانیش حاڵه‌ته‌كه‌ى خۆیانیان بۆ گێڕایه‌وه‌ كه‌ چاوه‌ڕوانین تاسه‌ر جۆگه‌ و ئاوه‌كه‌ چۆڵ ببێ و مه‌ڕ و ماڵاته‌كه‌مان ئاو بده‌ین و باوكمان ناتوانێ به‌م ئه‌ركه‌ هه‌ڵسێت، چونكه‌ پیر بووه‌ و په‌كى كه‌وتووه‌، خێرا (موسا) ماڵاته‌كه‌ى برده‌ پێشه‌وه‌ و كاره‌كه‌ى بۆ ئه‌نجام دان.

كاتێك كه‌ گه‌ڕانه‌وه‌ به‌سه‌رهاته‌كه‌یان گێڕایه‌وه‌ بۆ باوكیان و داوایان لێ كرد، به‌ڵكو به‌كرێ بیگرێ و ئه‌و ئه‌ركه‌یان له‌كۆڵ بخات، ده‌ستبه‌جێ باوكیان به‌ده‌م داواكه‌یانه‌وه‌ چوو، هه‌ر بۆیه‌ یه‌كێك له‌ كچه‌كانى نارد به‌ شوێنیاو مامه‌ڵه‌یان له‌سه‌ر كاره‌كه‌ به‌ئه‌نجام گه‌یاند به‌و شێوه‌یه‌ كه‌ خواى گه‌وره‌ باسى لێوه‌ ده‌كات و ده‌فه‌رموێ:

(وَلَمَّا وَرَدَ مَاء مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاء وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ * فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ * فَجَاءتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاء

قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ). [١٤٦]

**هه‌روه‌ها ئه‌سمای كچی ئه‌بوبه‌كری صدیق كه‌ خێزانی زوبه‌یری كوڕی عه‌وام بوو، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زوبه‌یر پیاوێكی نه‌دار بوو، نه‌یئه‌توانی خزمه‌تكار بگرێ و بژێوی بدا، هه‌ر بۆیه‌ ئه‌سما یارمه‌تیده‌ری بوو له‌ كاره‌كانی ده‌ره‌وه‌ی وه‌ك كشتوكاڵ كردن و هه‌روه‌ها خزمه‌تكردنی ماڵ و منداڵ ته‌نانه‌ت ئه‌سپه‌كه‌شی، كه‌س ڕێگر نه‌بوو له‌ئاست ئه‌و ئه‌رك و كاره‌ی كه‌ ئه‌سما پێی هه‌ڵده‌ستا، چونكه‌ هه‌موو ده‌ور و به‌ره‌كه‌ی ئه‌یانزانی كه‌ ناچارییه‌ و بگره‌ ته‌شویق و ئافه‌رینیشیان ئه‌كرد له‌سه‌ر ئه‌و پشتیوانی و یارمه‌تییه‌ی كه‌ ئه‌نجامی ئه‌دا به‌رانبه‌ر به‌ مێرد و ماڵ و خێزانه‌كه‌ی[147].**

**هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌م بابه‌ته‌ و لاپه‌ڕه‌ (٢٣٢)ی كتێبه‌كه‌دا نووسه‌ر باس له‌ كار كردنی ژنانی سعودیه‌ ئه‌كات كه‌ زۆر به‌ كه‌می له‌ دام و ده‌زگاو بازاڕه‌كاندا كار ده‌كه‌ن و ده‌ڵێت: له‌ وه‌ڵامی ئافره‌تێكدا سه‌باره‌ت به‌كاركردن سه‌رنووسه‌ری لاپه‌ڕه‌ی ئایینی سعودیه‌ كه‌ (ته‌مسیلی كاربه‌ده‌ستانی سعودیه‌ ده‌كات) ئه‌ڵێ: له‌به‌ر بوونی جیاوازی پێكهاتی فنیركی و كاركردنی بیۆلۆجی، هه‌ر یه‌ك له‌و دوو ڕه‌گه‌زه‌ ده‌ورێكی له‌ناو خێزاندا پێ ده‌سپێرێ، له‌ مێرد وا چاوه‌ڕوان ده‌كرێ ده‌سته‌به‌ری پێداویستییه‌كانی خێزان بكات، ئه‌گه‌ر به‌ ته‌واوی نه‌توانێ ئه‌نجامی بدات ئه‌گه‌ر داهاتی زۆر كه‌م بوو كه‌ نه‌توانێ تا ڕاده‌ی پێویست ژیانێكی گونجاو، به‌و مه‌رجه‌ی كه‌ هاوسه‌ره‌كه‌ی به‌دڵی بێت، ده‌سته‌به‌ر بكات، ئه‌وا هه‌ردووكیان ده‌توانن كار به‌و مه‌به‌سته‌ بكه‌ن، هه‌رچی چۆنێك بێت.**

---

[146] سوره القصص الآيات: ٢٣ — ٢٤ — ٢٥ .

[147] أخرج الإمام البخاري رحمه الله تعالى في صحيحة عن أسماء بنت أبي بكر ﵂ قالت: (تزوجني الزبير وماله في الأرض من مال ولا مملوك ولا شيئ غير ناضج وغير فرسه فكنت أعلف فرسه وأستقي الماء وأخرز غربه وأعجن ولم اكن أحسن أخبز، فكان يخبزه جارات لي من الأنصار، وكن نسوة صدق، وكنت انقل النوى من أرض الزبير التي أقطعه رسول الله ﷺ على رأسي، فلقيت رسول الله ﷺ ومعه نفر فدعاني فقال: (اخ. اخ، ليحملني خلفه فاستحيت وذكرت الزبير وغيرته. قالت: فمضى فلما أتيت، أخبرت الزبير فقال: والله لحملك النوى كان أشد علي من ركوبك معه إقالت: حتى أرسل اليَّ ابوبكر بعد بخادم، فكفتنى سياسة الفرس، فكأنما أعتقني).

**١ـ مێرد مافی ئەوەی هەیە هەرکات بە پێویستی زانی کۆتایی بەکاری هاوسەرەکەی بهێنێ.**

**٢ـ مێرد مافی ئەوەی هەیە، بەرهەڵستی هەر کارێك بکات کە هەست بکات هاوسەرەکەی تووشی ئازار، لە خشتەبردن و بێحورمەتی دەکات.**

**٣ـ ژنی مێرددار مافی ئەوەی هەیە هەرکات پێیخۆش بوو، کۆتایی بە کارەکەی بهێنێ.**

**ئاشکرایە کە دیاری کردنی ئەو سێ خاڵە لە بەرژەوەندی خێزان و خانەوادەیە کە لە کاتی کەمی داهاتی خێزاندا ژن و مێرد پێکەوە ئەتوانن کار بکەن، کارکردنی ژنەکە لە دەرەوەی ماڵدا بە خاتری خێزانەکەی ئەرکێکی زیادەیەو ئەیخاتە سەرشانی خۆی، هەر بۆیە ئەتوانین حەق بدەین بە ڕەوایی ئەو سێ خاڵە:**

**خاڵی یەکەم: کاتێ کە مێردەکە زانی داهاتی ماڵ وەك پێویست بەدەست هێنراوە و ژیانیان دەبات بەڕێوە، ئەتوانێ خێزانەکەی بگێڕێتەوە ماڵەوە و ئەو ئەرکەی لە کۆڵ بخات.**

**خاڵی دووەم: مافی ئەو مێردەیە بگرە ئەرکی سەرشانیشیەتی کاتێك کە زانی کاری خێزانەکەی لە دەرەوەی ماڵ مایەی ئازار و بێحورمەت و لەخشتەبردنە بەرهەڵستی بکات و ڕێگیر بێت لە ئاست ئەو کارەدا، چونکە ئەو ژن و پیاوە هەریەکەیان بەرگ و داپۆشەر و ناموسی یەکترن هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ) کەواتە پێویستە پارێزگاری لەیەکتر بکەن. هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً).[١٤٨] هەروەها لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە ئەفەرموێ: (الرجل راعٍ في أهلهِ وهو مسؤل عن رعيتة).[١٤٩]**

**کەواتە پیاو بەرپرسیارە بەرانبەر بە خێزانەکەی لە هەر گرفت و ئازار و نەهامەتییەك کە تووشی ببێت.**

**خاڵی سێهەم: سەبارەت بەم خاڵەش زۆر ڕوون کراوەتەوە کە ژن هەموو مافی ژیانی لەسەر مێردەکەیەتی لەبەر ئەوە ئەو کارەشی کە ئەیکات بە ویستی خۆیەتی و**

148 سورة المريم : الآية (٦) .

149 صحسح البخاري بشرح العسقلاني، ج٩ ، ص٢٥٤ .

هەرکات ئارەزووی کرد ئەتوانێ وازی لێ بهێنێ، لەبەر ئەوە مێرد بۆی نییە بە زۆر کاری پێ بکات و بژێوی پێ دەربهێنێ، تەنانەت لە ڕوانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوەو ڕەئی زۆربەی زانایان لەوەدایە کە خزمەت کردنی مێرد و بەجێهێنانی کارەکانی ناوماڵ لەسەر ژنان نییە، بەڵکو ئەو کارانەش کە ئەیکات خۆبەخشەو مێرد ناتوانێت بە زۆر پێی بکات، بەڵگەشمان لەسەر ئەم بۆچوونە فەرمایشتی ئەم بەڕێزانەیە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

١ـ لە فیقهی شافعی ئەبی ئیسحاقی شیرازیدا هاتووە کە: (ولایجب علیها – أي علی الزوجة – خدمته – أي خدمة زوجها- في الخبز والطحن والطبخ والغسل وغیرها من الخدم، لأن المعقود علیه من جهتها هو الأستمتاع، فلا یعزمها ما سواه)[١٥٠]. واتە: واجب نییە لەسەر ژن خزمەت کردنی مێردەکەی لە ڕووی نان کردن و هاڕینی دانەوێڵە (دەستاڕ) و چێشت لێنان و جل شتن و.. هتد. لەبەر ئەوەی گرێبەستی هاوسەرییەکە تەنها لە ڕووی چێژوەرگرتنەوەیە و ناتوانێ لەوە زیاتر پەیوەستی بکات.

٢ـ عەلائەدینی کاسانی لە (البدائع)دا ئەڵێت: (ولو جاء الزوج بطعام لحتاج الی الطبخ والخبز، فأبت المرأة الطبخ والخبز لاتجبر علی ذلك، ویؤمر الزوج أن یأتي لها بطعام مهیاً وذکر الفقیه أبو لیث أن هذا اذا کان بها علة لا تقدر علی الطبخ والخبز أوکانت من بنات الأشراف).[١٥١]واتە: ئەگەر مێرد خواردنی بردەوە بۆ ماڵەوە و پێویستی بە لێنان و نان دروست کردن بوو، ژنەکە دروستی نەکرد، پیاوەکە ناتوانێ زۆری لێ بکات، ئەو کاتە ئەبێ پیاوەکە خواردنی ئامادەکراوی بۆ بهێنێ. هەرچەندە زانا ئەبولەیس شیکاری ئەم بۆچوونەی کردووە بەوەی کە ئەگەر ژنەکە عوزرێکی هەبوو لە دروست کردنیدا، یاخود ئەو ژنە لە بنەماڵەیەکی ناودار و ڕێزدار بوو.

٣ـ لە (الفتاوی الهندیه)ی فقهی حەنەفیدا هاتووە کە: (وإن قالت لا أطبخ ولا أخبز لا تجبر علی الطبخ والخبز وعلی الزوج أن یأتیها بطعام مهیّأ، أو یأتیها بمن یکفیها عمل

150 المهذب وشرحة تكملة المجوع، ج١٥ ، ص٥٨١ .

151 البدائع ج٤ ، ص٢٤ .

**الطبخ والخبز)[152]. واتە: ئەگەر ژنەکە وتی نە چێشت لێ ئەنێم و نەنان ئەکەم، ئەوا زۆری لێ ناکرێ و لەسەر مێردەکەیە کە خواردنی ئامادەکراوی بۆ بهێنێ یا کەسێکی بۆ بهێنێ واتە (کارەکەر) کە بتوانێ بەکاری نان و چێشت هەڵسێ.**

**٤ ـ لە مەزهەبی حەنابلەدا ئەڵێن:** (ليس على المرأة خدمة زوجها من العجن والخبز والطبخ وأشباهه ككنس الدار وملئ الماء من البئر، نصّ عليه أحمد، لأن المعقود عليه من جهتها هو الإستمتاع بها، فلا يلزمها غيره كسقي دوابه وحصاد زرعه).[153] ولكنهم مع هذا قالوا: (لكن الأولى لها فعل ماجرت العادة بقيامها به لأن العادة بيامها به، ولا لأن العادة لا تنتظم المعيشة بدونه ولا تصلح الحال إلا به).[154]

**واتە: لەسەر ژن نییە خزمەت کردنی مێردەکەی لە ڕووی هەویر شێلان و نان کردن و چێشت لێنان و گسك دان دەرهێنانی ئاو لە بیر.**

**ئیمامی ئەحمەدیش هەر هەمان دەق ئەڵێت لە سەری، لەبەر ئەوە ئەو گرێبەستی هاوسەرگیرییەی کە کردوویەتی لەگەڵیدا تەنها چێژوەرگرتنییەتی لێی، ئیتر بۆی نییە پەیوەستی بکات بە ئاودانی وڵاخەکەی و دروێنەی کشتوکاڵ و زەراعەت کردن، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئەڵێت: (بەڵام لە پێشتر و چاکتر بۆ ژنەکە ئەوەیە کە وەك عورف و عاداتی دەوروبەرەکەی مامەڵە لەگەڵ کارەکانیدا بکات، چونکە ژیان ڕێك ناخرێت و چاك نابێت ئەگەر لەگەڵ عورف و عادەتی دەوروبەرەکەت هەڵس و کەوت نەکەیت).**

**لە ڕاستیدا بۆچونەکانیان جێگای قبوڵ و ڕێزە و هەر کامێکیان بگریت خۆی بۆ خۆی خزمەت بە خێزان و خانەوادە دەکات، بۆ نموونە لەسەر بۆچوونەکانی ئیمامی شافعی و... هتد. ئەگەر پیاو توانی کارئاسانی بۆ ژن بکات و ئیشکەرێکی بۆ گرت، ئەوا ئەو ژنە بە ئاسانی فریای پەروەردەکردنی منداڵەکانی دەکەوێت و ئەتوانێت وەك پێویست بەهرەمەندیان بکات لە سۆز و خۆشەویستی و ڕێنمونی کردنیان بە کاری دروست لە**

---

[152] الفتاوى الهندية، ج١ ، ص٥٤٨ .

[153] (المغني) ج٧ ، ص٢١ ، (كشاف القناع) ج٣ ، ص١١٦ .

[154] (المغني) ج٧ ، ص٢١ ، (كشاف القناع) ج٣ ، ص١١٦ .

هەمان کاتیشدا دەرونی ئارامو کەشێکی لەبار ئەبێت بۆ مامەڵە کردنی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، نەك وەك ئیشکەرێکی ماندوو تەنها بە جل شتن و رێك و پێك کردنی ماڵ و گسك دان و چێشت لێنان و پاك و خاوێنی ڕاگرتنی ماڵدا بگات و توانای وەڵام دانەوی تەنانەت منداڵەکانیشی نەبێت، بەڵام ئەگەر پیاوەکە لە توانایدا نەبوو، یاخود عورفی ناوچەکە هەڵی نەگرت کە ئیشکەرێکی هەبێت، ئەوا پێویستە وەك ئافرەتانی خزم و دراوسێ و دۆستانی شان بداتە بەر کارەکانی و تۆکمەیی خێزانەکەی بپارێزێ، چونکە ڕیعایەت کردنی عورف یەکێکە لە بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام، بەڵام پێویستە پیاویش بەوە بزانێت کە لە لای جمهوری زانایان ئەو کارانە واجب نییە لەسەر ژن، بەڵکو بە کارێکی چاك و خۆبەخشی ژنەکەی بزانێت و ئەرکی زیادە و داوای زیاد لە سنووری نەخاتە ئەستۆی و هەمیشە بە هەڵس و کەوتی جوان و قسەی خۆش‌و یارمەتیدەری بێت لە خزمەت کردن و بەجێ هێنانی کارەکانیدا.

لەڕاستیدا کاتێك کە دیراسەی ئەم ئیسلامە ئەکەیت و ئەتەوێ مامەڵەی لەگەڵ بکەیت وا هەست ئەکەیت کە تەنها بە خاتری ژنان و بە پارێزگاری لێکردنیان دابەزیبێتە سەر پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ.

هەروەها سەبارەت بە کەمی ئافرەتانی سعودیە لە بوارەکانی کارکردندا فاکتەرێکی لەبارە بۆ بەرەوپێشچوونی وڵات، چونکە دەوڵەت ئەتوانێ کۆمەڵێ ئافرەتی شارەزا و بە توانا هەڵبژێرێ و پێیان بگەیەنێ بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکانەی کە پەیوەستە بە چین و توێژی ئافرەتانەوە. پزیشك، مامۆستاو.. هتد.

پڕکردنەوەی کارگە و بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بە توێژی پیاوان و نەهێشتنی بەتاڵە لەو توێژەدا کە ئەمڕۆ زۆربەی ئەو شوێنانە ئافرەتان پڕیان کردۆتەوە بەبێ ئەوەی کاری خۆیان بێت و لەگەڵ تواناکانیاندا گونجاو بێت.

# خەتەنە کردن:

نەوال سەعداوی فیمینستی میسری لە لاپەڕە (٢٩٣)ی کتێبێکدا ئاماژە بە کاریگەری عاتیفی و فیزیکی خەتەنە بەسەر ژنانی میسرەوە دەکات و دەڵێت: فەرمائیشتە تێکدەرەکانی ئیسلامە کە ژیانی ژنانی تێکداوە، واتە ئیسلام بە بەرپرسی یەکەم دەزانی بە لەدەستدانی چێژی سێکسی.

لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەگەر نەوال سەعداوی خوێندنەوەیەکی دروستی بۆ ئەو بابەتە ببوایە ئەوا بەو ئاسانییە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی تاوانبار نەدەکرد بەوەی کە تێکدەری ژیانی ژنانی میسر بووە، بەڵکو دەبوو مێژووی سەرهەڵدانی خەتەنەی کچانی بزانیایە کە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فیرعەونەکانی میسر، فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەری ﷺ فەرمان بە خەتەنەکردنی کچان ناکات، بەڵکو فەرموودەیەکیش کە هاتبێت و کاری پێ بکرێت باس لە شوێنی خەتەنەی هەردوو رەگەز دەکات کە بە بەریەککەوتنیان غوسڵ واجب ئەبێت، هەروەك ئەم فەرموودەیەکە ئیبن ماجە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذ التقى الختانان وجب الغسل) واتە: ئەگەر خەتەنە کراوەکان بەریەك کەوتن غوسڵ کردن فەرز دەبێت، یا ئەو فەرموودەیەی کە لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە: (ومس الختان الختان فقد وجب الغسل). واتە: ئەگەر جێی خەتەنەکراو بەر جێی خەتەنەکراوی ڕەگەزی بەرانبەر کەوت غوسل کردن فەرز دەبێت.

ئەم فەرموودانە ئەوە ناگەیەنن کە خەتەنە کردن بۆ کچان پێویست بێت، بەڵکو تێگەیاندنی عەرەبەکانە بە چۆنێتی فەرز بوونی غوسڵ، چونکە لەناویاندا خەتەنەی کچان باو بووە و زانیویانەو حاڵی بوون پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی چییە لە فەرز بوونی غوسڵ، فەرموودەکانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خەتەنەی کچان باو بووە لە ناویاندا.

بەڵام ئەو فەرموودانەی تر کە هەمیشە ئەوترێتەوە و ئیسلامی پێ تاوانبار دەکرێت کە گوایە داوای خەتەنە کردنی کچانی کردووە لاوازن و حوکمی شەرعییان پێ دەرناکرێت، وەك ئەو فەرموودەیەی کە ئوم عەتییە دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

ئافرەتێك لە مەدینە كچانی خەتەنە دەكرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (لا تنهكي، فأن ذلك اخطى للمرأة وأحبُّ الى البعل)[155] واتە: زۆری لێ نەبڕێت، چونكە هەبوونی ئەوە بۆ ئافرەت خۆشترەو پیاویش پێی خۆشە، لە ڕیوایەتێكی تردا ئەفەرموێ: (إذا خففت فأشمي لا تنهكي: فأن ذلك انظر للوجە وأحطى عند الزوج)[156] واتە: ئەگەر بڕیت زۆری لێ مەگرە، چونكە مانەوەی مایەی ڕووناكی ڕوخساری ژنە و خۆشیی مێردەكەیە.

ئەو فەرموودەیەشیان كە هەندێك لە زانای مەزهەبەكان بە تایبەتی ئیمامی شافیعی ئیعتمادیان كردۆتە سەر كە دەفەرموێ: (الختان سنة للرجال مكرمة للنساء). واتە: خەتەنەكردن بۆ پیاوان سوننەتە و پەسەندیشە بۆ ژنان، كە ئیمامی ئەحمەد گێڕاوێتییەوە فەرموودەیەكی لاوازە و نابێتە بەڵگە و هیچ حوكمێكی شەرعی وەرناگیرێت لە فەرموودەی (ضعیف)ەوە.

كەواتە خەتەنە كردنی كچان لە ئیسلامدا نە فەرزە و نەسونەت، بەڵام خوو و نەریتێكی عەرەبەكانی پێش هاتنی ئیسلام بووە و پێغەمبەر ﷺ زۆر بە حیكمەت و داناییەوە چارەی ئەو بابەتە دەكات و خەڵكەكە تێئەگەیەنێت كە مەیكەن، خۆ ئەگەر كردیشتان با كەمی لێ بكرێتەوە، هەروەها لە لاپەڕە (٥٤-٥٥)دا نووسەر كچانی خوا زۆر بەدرێژی باس لە خەتەنەی فیرعەونی دەكات و دەڵێت: لەبەر ئەوەی خەتەنە لە لایەن هەندێك مەسیحی و كەسانی سەر بە ئاینی تر ئەنجام دەدرێ، هەندێك لە موسڵمانان هەستیان بریندار دەبێت ئەگەر ئەم نەریتە بە باوەڕە ئاینیەكەیانەوە ببەستنەوە، چونكە بێگومانن لەوەی كە خوای گەورە هیچ ئەندامێكی لە لەشدا بەبێ هودە دروست نەكردووە، لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانم كە بڵێم دیاردەی خەتەنەی فیرعەونی دیاردەیەكی زۆر خەتەرناك بووە لەسەر تەندروستی كچانو ژنان بە هۆی

[155] ئەبو داود گێڕاویەتییەوەو بە لاوازیشی داناوە.

[156] أبو داود لە (السفن) ٤/ ٢٦٨ و ٥٢٧١ گێڕاوێتییەوەو البیهقي لە (السنن الكبری) و ئیبن عدي لە (الكامل) ٦/ ٢١٧...هتد هەمووشیان بە لاوازیان داناوە.

**بڕینی هەموو میتکەکە، بەداخەوە ئەم نەریتە جاهیلیە تا ئێستاش لە شوێنێکی وەکو میسرو سۆماڵ دا هەر بەردەوامە[157].**

[157] لاپەڕە (٥٤-٥٥) کتێبی (کچانی خوا).

# دواوتە

خوێنەرانی بەڕێز !

هەریەك لە ئێوە کە ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە و بەراوردی ئەکات بەقسە بێ سەروبەرەکانی (جیرالدین)ی نووسەر، یان نوری کەریمی وەرگێڕ ئەو پرسیارەی بۆ دروست ئەبێت، کە ئایا هۆی چییە ئێمە ئەوەندە خاتریانمان گرتووە و لەسەر هەموو قسەیەکیان وەڵامی پێویستمان نەنووسیوە و تەنیا لەسەر ئەو چەند مەسەلەیە نووسیومانە.. لە وەڵامدا دوو خاڵ ئەڵێین:

یەکەم: وەڵام نەنووسینمان لەسەر هەموو بڕگەو گومانێکی ئەو کتێبە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پڕۆژەی تیشك لەسەر زۆرترین ئەو گومانە کتێبی سەربەخۆی نووسیوە و وەڵامی پێویستی داونەتەوە و دووبارە کردنەوەی لە لایەن ئێمەشەوە نە باشەو نە پێویستیشەو هەرکەسیش بیەوێ بابگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی ژمارە (٢٩، ٢٣، ٢١، ١٦، ١٣، ٣، ٢، ١)ی پڕۆژەی تیشك.

دووهەم: ئێمەی ئافرەتان وەك (خاوەنی قەزیە) بە پێویستی ئەزانین زیاتر تیشك بخەینە سەر مەسەلەی پەیوەندییەکان بە ئافرەتانەوە وەك ئەو باسانەی کە هەڵمان بژاردوون.

ڕاستە کتێبی (کچانی خوا) تا بڵێی کتێبێکی بێنەزاکەتەو ئەوەی بڵێی ئەدەب ڕیعایەتی نەکردووە، کاتێك باسی خوا و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ئەکات کە هەر سێ بنەما گەورەکەی ئیسلامەتین، جێگەی خۆشیەتی لەسەر هەموو بڕگەیەکی بوەستی، بەڵام وەك وتمان هەر ئەوەندەمان لەم قۆناغەدا بەپێویست زانی و خوا پشتیوان بێت تا ئەوان دەست لە کۆڵی دین نەکەنەوە، ئێمەش دەست لەکۆڵیان ناکەینەوە و تاکە چەکی دەستیشمان بریتیە لە (فیکر) و (قەڵەم) و (منتق) و (بەڵگە).

ـ لەم دوا وتەیەدا حەز ئەکەم چەند تێبینییەك بخەمە بەردیدی خوێنەران بەتایبەتی ئەوانە کە ئەگەڕێنەوە بۆ کتێبە بنەڕەتییەکە:

**تێبینی یەکەم: نووسەر و وەرگێڕ کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بیرو باوەڕی شیعە مەزهەبەکان وەك سەرچاوە و وەك واقیع و شوێنیش، چونکە لە زۆر شوێنی کتێبەکەیاندا نموونە بە بیروڕاکانی ئەوان یان واقیعی دەوڵەتی ئێرانی و کۆمەڵگەی ئەوان دەهێننەوە و ئەیکەنە تەوەرەی ڕەخنەکانیان، ئەمەش وەك ئاشکرایە جۆرێك لە ستەمی تێدایە، چونکە زۆربەی مەبناکانی مەزهەبی شیعەگەرایی لە لایەن زانا ئیسلامییەکانەوە ررون کراوەتەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بنەما ئیسیلامییەکانەوە نییە و لەسەر بنەماو بناغەی جگە لە ئیسلام هەستاونەتەوە و دروستکراون.**

**تێبینی دووهەم: کتێبەکە بە ئوسلوبێکی نیشائی نووسراوە نەك ئوسلوبێکی ئەکادیمی و شێوازی توێژینەوەی زانستیی، ئەوەش وادەکات کە نەتوانێ نووسەر دادگایی بکەی لە ڕووی بەکارهێنانی سەرچاوەکانەوە، قسەش وەك ئەڵێن هەژارە و هەموو کەس (ڕاستگۆ و درۆزن) ئەتوانن بیکەن، بەڵام ئەوەی ڕاستگۆ لە درۆزن جیا دەکاتەوە ئەوەیە ئەمیان بەڵگەی نییە و ئەویان بە بەڵگەوە قسە دەکات.**

**تێبینی سێهەم: زۆرترین هێرشی نووسەر و وەرگێڕ لەسەر پێغەمبەر و ژنانی پێغەمبەر و ژیانی تایبەتی پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە منیش زۆربەی نووسینەکەم تایبەت کرد بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانە بەڕێزەکانیدا، کە دایکی ئێمەن و تەواوی مافەکانی دایکیان بەسەرمانەوە هەیە و ئەبێت بیانپارێزین.**

**تێبینی چوارەم: لە ڕوانگەی چەند خاڵی ئەم کتێبەوە من خۆم بیرۆکەی زۆرم بۆ دروست بوو، کە سوپاسی خوا و پاشان سوپاسی پرۆژەی تیشك ئەکەم کە ئەم دەرگایەیان لێ کردمەوە تا لێوەی جارێکی تر بیروڕاکانم دابڕێژمەوە و سەرلەنوێ و پاش دابڕانێك بکەومەوە خوێندنەوەی زیاتر و زانستی تری ئیسلام، یەکێك لەو بیرۆکانەی کە لە نووسینەکەشدا ئاماژەم بۆ کردووە ئەوەیە کە بە ڕاستیی ئیسلام تاکە دینێکە زۆر ورد هاوسەنگیی لە ژیاندا ڕاگرتبێت، ئەرك و مافی دیاریی کردبێت و لە هەر حاڵەتێکیشدا ئەرکی ئەمی دابێت بەسەر شانی ئەودا ئەوە لەبەرانبەریدا مافێکی بۆ دەستەبەر کردووە، بە پێچەوانەشەوە هەر مافێکی دیاریی کردبێت لە**

بەرانبەریدا ئەرکێکی لەکۆڵ بەرانبەرەکەی هەڵگرتووەو داویەتی بەسەر خاوەن مافەکەدا، لە کوێشدا ئەو هاوسەنگییە ون بووبێت و نەبینرێت ئەوەیان ئێمە پەیمان پێ نەبردووە یان چووەتە ناو ئەو بابەتەی کە لە شەریعەتی ئیسلامیدا پێی ئەوترێ (الغنمُ بالغرم).

تێبینی پێنجەم: من لەم نووسینەدا هەوڵم داوە وەك کەسێك بنووسم کە نەزانین یان بێویژدانی نووسەر وروژاندویەتی، چونکە بەڕاستی شورەییە مرۆڤ لە شتێك شارەزا نەبێت قسەی لەسەر بکات و نەك هەر ئەوە بەڵکو حوکمی ناڕەواش بدات بەسەریدا! لەوەش شورەییتر ئەوەیە کە مرۆڤ ئاگادار بێت لەڕاستی مەسەلەیەك و کەچی چاوی لێ دابخات و چەواشەکاری دروست بکات، وەك ئەم نووسەرەی لای ئێمە. بۆ نموونە، کابرا دان بەوەدا ئەنێت کە ئیسلام بە سیستمی (میرات بردن) مافی چاکی بۆ ئافرەتان دەستەبەر کردووە، کەچی لەو لاوە چی شتی ناڕەوا هەیە بەرانبەر قورئان ئەیلێت.

کابرا نازانێ حاڵەتەکانی دابەشکردنی میراتی دابەش بووە بەسەر زیاد لە (٣٠) حاڵەتدا و ئەو حاڵەتانەش دابەش بوون بە سەر پێنج حاڵەتدا.

- حاڵەتێك ئافرەت چەند قاتی پیاو ئەبات.
- حاڵەتێك ئافرەت تێیدا زیاد لەپیاو ئەبات.
- حاڵەتێك ئافرەت تێیدا ئەوەندەی پیاو ئەبات.
- حاڵەتێك ئافرەت تێیدا نیوەی پیاو ئەبات.
- حاڵەتی واش هەیە ئافرەت میرات ئەباو پیاو نایبات.
- یان ئەوە نازانێت کە حاڵەتەکانی شایەتیدانی ئافرەت لە دە حاڵەت هەیەو ئەم حاڵەتانەش دابەش بوون بەسەر چەند حاڵەتی تردا کە هەمووی چوون یەك نین.
- حاڵەتی واهەیە ئافرەت تێیدا جێگەی چوار شایەت ئەگرێتەوە.
- حاڵەتی واهەیە ئافرەت جێگەی دوو شایەت ئەگرێتەوە.
- حاڵەتی واهەیە ئافرەت جێگەییەك شایەت ئەگرێتەوە.
- حاڵەتی واش هەیە بە دوو ئافرەت جێگەیەك شایەت ئەگرێتەوە.

كه ئه‌مه‌ی كۆتاییان یه‌ك حاڵه‌ته له كۆی زیاد له (١٠) حاڵه‌ت كه ئه‌و حاڵه‌تانه‌ی تر له‌م حاڵه‌ته زۆر گرنگتر و ترسناكتر و هه‌ستیارترن وه‌ك له نووسینه‌كه‌دا باسمان كردووه.

جا بۆیه ئه‌ڵێم نه‌زانین یان بێویژدانی كردن مایه‌ی نیگه‌رانی و تووڕه‌بوونی مرۆڤی به‌رانبه‌ره و مایه‌ی شه‌رمه‌زاری و ڕیسواییشه بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی.

خوای گه‌وره‌ش جوان ئه‌فه‌رموێ: (وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) (المائدة: ٨).

ئه‌گه‌ر ڕقتان له خه‌ڵكێك بوو با ئه‌و ڕقه واتان لێ نه‌كات داد به خه‌رج نه‌ده‌ن، ناداد به خه‌رج بده‌ن، چونكه ئه‌وه نزیكتان ئه‌خاته‌وه له خوا ناسین و له خوا بترسن، چونكه خوای گه‌وره، ئاگایه له هه‌موو كار و كرده‌وه‌یه‌كتان.

زانایانی ئیسلامیش له‌م ئایه‌ته‌وه ئه‌وه‌یان وه‌رگرتووه كه داد بناغه‌ی ده‌سه‌ڵاته و پێویسته مرۆڤ هه‌وه‌سپه‌رست نه‌بێت و به (علم) و به (داد) له‌سه‌ر هه‌موو شتێك و هه‌موو كه‌سێك قسه بكات.

ئیبن ته‌یمیه له (منهاج السنة: ٤/ ٣٣٧) دا ئه‌فه‌رموێ: (الكلام في الناس يجب أن يكون بعلم وعدل لا بجهل و ظلم كحال أهل البدع).

ئه‌مه‌و له سه‌ره‌تا و له‌كۆتاییشدا هه‌ر سوپاس و ستایشی خوا ئه‌كه‌م و پڕ به دڵ پڕ به‌ده‌م سه‌ڵات و سه‌لام له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌كه‌م كه فێری خۆشه‌ویستی و فێری ویژدانی كردووین.

روقیه صدیق عه‌بدولعه‌زیز

سلێمانی / ٧ / ٧ / ٢٠٠٨

- ئەو سەرچاوانەى كە سوودم لێ بينيوە:
١- تەفسيرى ڕامان - ئەحمەد كاكە مەحمود.
٢- تةفسيرى صفوة التفاسير - محمد على الصابونى.
٣- تةفسيرى في ظلال القرآن - سيّد قطب.
٤- تەفسير مختصر ابن كپير - محمد على الصابونى.
٥- تەفسيرى ٣ سورەت (نور، ئەحزاب، حجرات)، ئامينە صديق عبدالعزيز.
٦- المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم ، د. عبدالكريم زيدان.
٧- المرأة في الفكر الأسلامي - جمال محمد فقي رسول الباجوري، ج٢.
٨- يافتاة الأسلام - صالح بن ابراهيم البليهي.
٩- دنيا المرأة - آية الله السيد محمد حسين فضل الله.
١٠- الموضة في التصور الأسلامي - الزهراء فاطمة بنت عبدالله.
١١- المرأة المسلمة - محمد فريد وجدي.
١٢- نساء مؤمنات - د. يوسف القرضاوي.
١٣- مسألة الحجاب - مرتضى المطهري.
١٤- تعدد الزوجات في الأسلام - عبدالله ناصح علوان.
١٥- المرأة في الكتاب والسنة - بقلم يونس شيخ ابراهيم السامرائي.
١٦- صحابيات حول الرسول - بقلم محمد راجى حسن كتاس.
١٧- نساء حول الرسول - بقلم محمد مهدي الاستانبولي و مصطفى ابو النصر الشلبي.
١٨- آداب الحياة الزوجية - بقلم خالد عبدالرحمن العك.
١٩- واجبات المرأة المسلمة - بقلم خالد عبدالرحمن العك.
٢٠- الى المحجبات أولاً - محمد سعيد مبيض.
٢١- مركز المرأة في الحياة الأسلامية - د. يوسف القرضاوي.
٢٢- خەتەنەكردن - ئينتەرنێت.
٢٣- فقه السنة سيّد سابق.
٢٤- ابوبكر الصديق - على محمد الصلابي.

٢٥- علي بن أبی طالب - علی محمد الصلابي.
٢٦- السيرة النبوية - علی محمد الصلابي.
٢٧- صفة الصفوة - ابن الجوزي.
٢٨- الاستجاب في معرفة الأصحاب - ابن عبدالبر.
٢٩- الطبقات - ابن سعد.
٣٠- الاصابة في تميز الصحابة - ابن حجر العسقلاني.
٣١- ڕۆجیه گارودی، د. یحی المریضي.
٣٢- صحيح الجامع الصغير وزيادته الألباني.
٣٣- سایتەکانی ئینتەرنێت.
٣٤- ئافرەتە ناودارەکانی کورد- عبدالجبار موحەممەد الجباری.
٣٥- فتح الباري شرح صحيح البخاري - العسقلاني.
٣٦- بدائع الصنائع - علاء الدين الكاساني.
٣٧- المهذب وشرحه تكملة المجموع - الأمام النووي.
٣٨- المرأة بين الفقه والقانون - د. مصطفى السباعي.
٣٩- نيل الأوطار الشوكاني.
٤٠- فەرهەنگی دەریا - ڕزگار کەریم .
٤١- السيرة النبوية ابن هشام.
٤٢- حياة محمد حسنين هكيل.
٤٤- البداية والنهاية لإبن كثير.
٤٥- تأريخ الطبري للأمام الطبري.
٤٦- ژیانی پێغەمبەری مەزن (موحەممەد) - شێخ عبدالعزیز پاڕەزانی -.
٤٧- السنن أبو داود.
٤٨- الكامل في التأريخ لإبن أثير.
٤٩- لسنن الكبرى للنسائي.
٥٠- گۆڤاری بانگی حەق پەیوەندی ئیسلامی کورد.

٥١- المغني والشرح الكبير ابن قدامة المقدسي.

ئەمانەو هەندێ سەرچاوەی تریش کە لەشوێنەکانی خۆیاندا ئاماژەیان پێکراوە.

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان (كتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان رامان‌و سەرنج‌و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست‌و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید دكتۆر صەباح بەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام‌و سیاسەت، لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام‌و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێكهاتنی، ڕێكخستنی، چەكەكانی، هێزی دەریایی‌و شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە) قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کـۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شاربازێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:<br>ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەڵامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز |